








کۆبەرهەمی هۆنراوە


- ناوی پەرتووک: **تاسەبار**
- ژانر: کۆبەرهەمی هۆنراوە
- هۆنەر: حەسەن شافیعی
- کاری هونەری: سیامەند شاسواری
- نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم، مەی ٢٠٢٢
- نۆرەی چاپ: چاپی دووەم، ئۆکتۆبری ٢٠٢٢
- چاپخانە: چاپی ٤٩ کتێب
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

49books Publishing
چاپی ٤٩ کتێب
www.49plusbooks.co
ISBN. 978-91-89734-56-2

ئەم بەرهەمە:

پێشکەش دەکەم

بە هاوڕێ و هاوسۆز و هاوشین و هاوژینی زۆر ئازیزم

"مێهری زرێهگەر"

کە تەمەنێ خۆشەویستی پێ بەخشیم و:

لەگەڵ ئەودا و،

بە بوونی ئەو

گشت وەرزەکانم بەهار بوون...



# تاسەبار

## Saudade

**سەوداد**، وشەیەکی بەناوەرۆکی قووڵە لە زمان و کولتووری پورتوگالیدا، بە واتای دارەتێکی دەروونی و هەستێکی نۆستالژی و ماتەمین و دڵتەنگی و دڵمەردەیییە، لە نەبوون یان دووری ئاخ و زێد و خۆشەویستدا سەرهەڵئەدا، کە ڕەنگە ئیتر پێی نەگەینەوە یان نەی بینینەوە.

وشەی **سەوداد** هەرچەند پورتوگالییە، بەڵام بە فراوانی لە زمانەکانی تردا بڵاو بووەتەوە، لەبەر ئەوەی پێیان وایە تێگەیشتن لە واتای قووڵی ئەو وشەیە تەنها بۆ پورتوگالییەکان ئەلوێ؛ بۆیەشە لە زۆربەی زمانەکاندا وەکو خۆی بەکاری ئەهێنن.

**سەوداد** ناوی گۆرانییەکی سێزاریا ئیڤۆرا Cesária Évora گۆرانیبێژی بەناوبانگی خەڵکی وڵاتی کەیپ ڤێردە Cape Verde یان «کەپکەی سەوز»ە.








# کورتە
# ئۆتۆبایۆگرافی

- ناوم حەسەن شافێعی، کوڕی  مستەفا شافێعی و دڵبەر خوداجوو، خەڵکی سەقزم.
- لە ڕێکەوتی ١٧ی ڕەشەمەی ساڵی ١٣٣٣ی هەتاوی، بەرانبەر بە هەشتی مارسی ساڵی ١٩٥٥ی زایینی، کە ماڵی باوکم و باوەگەورەم هاتبوونە شاری بانە، من لەم شارە خنجیلانە واتا لە شاری بانە، لە دایک بووم.
- بنەماڵەی دایکی باوکم بە نێوی خورشید خان، کە کچی ئامینە خان و وەستا ساڵحی لوولەساز بووە، خەڵکی سلێمانی بوون و خورشید خانی دایە گەورەم، خوشکی شیری شێخ مەحموودی حەفید بووە و هەروەها خوشکی ڕەوانشاد میرزا فەرەجی شەهلایی لە بنەماڵەی شەهلاییەکانی شاری سەقز بوو.
- بنەماڵەی باوەگەورەی باوکیشم لە سنەدا ژیاون و باوەگەورەی باوکم بە نێوی حاجی فەرەجولا کە کوڕی حاجی شاوان و باوکی میرزا ساڵح و حاجی حەبیبەلا بووە

و ناسراو بە ماڵی "ناڵچە زێڕین" یان "پاژنە تەڵا" بوون.

- هاوژینم ناوی **مێهری زرێهگەرە** و دوو کوڕ و کچێکم هەن. کوڕەکانم **ئاکۆ** و **کاردۆخ** و ، کچەکەشم ناوی **شانۆ**یە.
- لە هەموو قۆناغە سەختەکانی ژیانمدا، هاوژینەکەم وەک قەڵا لە پشتم بووە و منداڵەکانیشم وێڕای بوونیان لەهەندەران، هەموو دەم پشتیوان و هاندەرم بوون.
- قۆناغی سەرەتایی و دوو ساڵ ناوەندییم لە فێرگەکانی پەهلەوی و پەهلەوی بانە (ناوە دزراوەکەی ڕەزا پالانی)[1]، خوێندوە و پاشان لە دوای چواردە ساڵ ژیان لە بانەی

---

١- **ڕەزا پالانی:** رەزا قەزاق، رەزا ماکسیم، سەردار سپا، کە وەکوو دارەدەستی ئینگلیس کوودتای لە دەسەڵاتی قاجاری تورکی ئاغوز کرد، بە ناوی رەزا شا دەسەڵاتێکی دامەزراند کە پاشتر پاشناوی پەهلەویان پێوە لکاند. لە **١٩٢٥** تا **١٩٤١**ی زایینی. رەزا قەزاق کە هەتیو بوو و بە هەژاری گەورە ببوو، هیچ ناو و نیشانێکی نەبوو. راوێژکارەکانی بە باشیان زانی ناوێکی بۆ هەڵبژێرن شیاوی پادشا بێ. بۆ نموونە **ڕەزا پالانی** واتە **کورتاندروو**یان کرد بە رەزا پەهلەوی گوایە، کۆلکەی بگاتەوە بە پەهلەوییە ساسانییەکان. ئیتر لەوە بگەڕێ ئەو چوار ملیۆن پەهلەوییە کە ماون و ئێستە هەن، هەر هەموویان کوردن و بە شانازییەوە خۆیان بە کورد ئەزانن.
ئینجا جاڕ درا کێ پەهلەوییە ئەبێ ناوی خۆی بگۆڕێ، ئیتر کەس بۆی نییە پەهلەوی بێ!
یەکێک لەو کەسانەی چیرۆکەکەی دەنگی دایەوە **مەحموودی پەهلەوی**، نووسەری بەناوبانگ و خاوەنی پەرتووکی هەشت بەرگی **مێژووی پەیوەندی رامیاری ئێران و ئینگلیز** بوو. کاتێکە ناوەکەیان لێ سەندەوە، وتیان ناوێکی تر هەڵبژێرە. ئەویش وتی جا کە ناوی خۆم بە کەڵەگایی لێبسێنن و نەتوانم هیچ بکەم، دیارە بەس مەحموودم و لەوە زیاترم شیاو نییە. لەو ڕۆژە بە دواوە، مەحموودی پەهلەوی، بوو بە **مەحموود مەحموود!**. فەرهەنگۆک

خۆشەویست کە لە ڕاستییدا خۆشترین ساڵەکانی تەمەنم بوو، بە هۆی جەڵدەی مێشک و نەخۆشین و خانەنشینی باوکمەوە کە کارمەندی کارگەی جگەرە دایرەی دوخانیات بوو، گەڕاینەوە بۆ سەقز.

• لە خوێندنگەکانی شاپوور و مێهرەگان لە شاری سەقز خوێندوومە و پاشان بە هۆی کۆچی دوایی باوکمەوە و باری نالەباری ئابووری ماڵەوەمان، سەرەڕای ئەوەی کە شاگردێکی نازیرەک نەبووم، لە پۆلی یازدەوە گەڕامەوە بۆ نۆ و چوومە شاری بیجاڕ لە پارێزکای کوردستان و دوو ساڵ لە دانشسەرای ڕاهێنانی مامۆستا لە شاری بیجار لە پارێزگای کوردستان، خوێندم و پاشان وەک مامۆستای فێرگەی سەرەتایی، گەڕامەوە بۆ سەقز و ساڵی ١٣٥٣ لە فێرگەی "مێهر" لە شەقامی شاناز، بووم بە مامۆستا.

• ساڵی ١٣٥٤ی هەتاوی، وەک "سپای دانش" لە شاری سەراب لە پارێزگای ئەردەوێڵ، شەش مانگی سەرەتاییم تەواو کرد و پاشان لە گوندی "ئاچیدەرێ" لە شاری مەهاباد، بۆ ماوەی ساڵ ونیوێ هەر وەک "سپای دانش"، وانەم دەگوتەوە.

• بە هۆی کێشەم لە تەک ئەفسەرێکدا، ماوەی ٩ مانگ کەوتمە بەندیخانەی نیزامی لەشکری ٦٤ی ورمێ و هەروەها پادگان یان سەربازخانەی قووشچی لە باکووری ورمێ. پاش تەواو بوونی زیندانیەکەم، گەڕامەوە بۆ سەقز و وەک مامۆستا، لە ئاواییەکانی قەڵەندەر و میرەدێ و پاشان ناوشاری سەقز، دەستم بە کار کردەوە.

• ساڵی ١٣٥٨ وێڕای تەواو کردنی دووهەمین دیپلۆم،

لە تاقیکردنەوەی سەرانسەری کونکووردا بەشدار بووم و وەکوو خوێندکاری «وێژەی بەراوەردکاری» (ادبیات تطبیقی) لە زانکۆی ئەبوورێحان بیروونیدا وەرگیرام، بەڵام هاوکات لەگەڵ داخستن و نۆژەنکردنەوەی سیستەمی زانکۆکانی ئێراندا، لەو ڕەحمەتەش بێوەری بووم!

• لە ساڵی ١٣٦٢ی هەتاوی لە کار لابرام و لە بەهاری هەر ئەو ساڵەدا، بە هۆی ئەندام بوون و چالاک بوون لە ڕێکخراوەی "کۆمەڵەی یەکسانی"، ماڵەکەم دەستی بە سەردا گیرا و خۆم لەگەڵ هاوژین و منداڵەکانم دەرباز کرد. ساڵی ١٣٦٩یش هاتمە تورکیە و پاش ساڵێ درام بە کانادا و ئێستاش لێرە دەژیم.

• لە منداڵیمەوە، لە شاری بانە و لە ڕێگەی ڕادیۆ کرماشانەوە و هەروەها بوونی پەرتووکی کوردی، بە هۆی نزیکایەتی شاری بانە لە باشووری کوردستان کە لەو سەردەمەدا مەکۆی فێربوونی کوردی بوو، فێری کوردی نووسین بووم و هەستم کرد بەوەی کە زۆر حەزم لە شیعرە و لە ماڵی باوەگەورەم، ڕەوانشاد ئاغە عەبەی خوداجوو، کوڕی ڕەوانشاد ئەسعەد بەگی دارۆغە کە لەو ماوەدا لە بانە بوون، بە پشتگەرمی باوەگەورەم، هەروەها دایەگەورەم بە ناوی کیشۆر سدیقی کە لە بنەماڵەی سدیقی سەقز و کچی خاتوو گوڵەندام و میرزا عەلی سدیقی، هەروەها حەز و ئارەزووی خۆم، وێڕای ئەوەی پەرتووکی کوردیم لە بەردەستدا بوو و هاوکات، هەموو شەو گوێگری کاروانی شیعر و مۆسیقای ڕەوانشاد شوکڕوڵای بابان و هەروەها شاعیری بلیمەت ڕەوانشاد سوارەی نەمر و پڕۆگرامی تاپۆ

و بوومەلێڵ لە ڕادیۆ کرماشانەوە بووم و دەتوانم بڵێم ڕادیۆ کرماشان، مامۆستای یەکەمم بوو لە نووسین و فێربوونی زمانی دایکییمدا.

• لە سەرەتای شەستەکانی هەتاوییەوە، کۆمەڵێ لە شیعرەکانی مەحموود دەروێش، کە لە پەڕتووکێکدا بە نێوی «**ادبیات مقاومت در فلسطین اشغالی**» (**وێژەی بەرخۆدان لە فەلەستینی داگیرکراو**) نووسینی "غەسان کەنەفانی"، کە بە فارسی بوو، وەرمگێڕانە سەر زمانی کوردی. هەروەها، ٣٠ دانەی بژاردە لە شیعرەکانی «پابلۆ نێرۆدا» شاعیری مەزنی شیلیایی، کە بە داخەوە کۆی ئەو وەرگێڕانانە و کۆمەڵێ بەرچاو شیعری دیکەی خۆیشم بەر پەلامار و شەڤخوونی کۆماری ئیسلامی کەوت و هەموو تێدا چوون.

• هەروەها سالانی ٥٩ و ٦٢ی هەتاوی، دوو جار ماڵەکەم تالان کرا و بە تایبەت لە ٦٢دا، هەموو شیعرەکانم لەگەڵ ماڵەکەم ڕۆیی و بە داخەوە زۆر لەو بابەتانەم تێدا چوون.

• ئێستاش ماوەی ٣١ ساڵە لە هەندەران دەژیم و لێرە خانەنشین بووم و فرەتر خەریکی کاری شیعر و وەرگێڕانی بابەتی شیعری و خوێندنەوەی کتێب و ئەو بابەتانەم.

• بەرهەمەکانم هەرچەند زۆربەی تێداچوون، بەڵام ئەوەندەی کە لای خۆمن، وەکوو پەڕتووکێ هێشتا چاپ نەکراون، بەڵام لە "سۆشیال میدیا" و شوێنی تردا بڵاو بوونەتەوە و هەروەها، لە ماوەی بوونیشم لێرە، هەوڵم داوە شان بە شانی ڕووداوەکانی نیشتمانەکەم هەڵوێست وەرگرم و بڵاویان کەمەوە.

• بە پێویستی دەزانم کە لە دوو توێی ئەم کورتە ئۆتۆبایۆگرافییەدا، گەرمترین سپاسی خۆم پێشکەش بە هاوڕێی زۆر دڵسۆز و ئازیزم کاک «سیامەند شاسواری» بکەم کە بەرپرسایەتیی سەرجەم کارەکانی ئەم پەڕتووکە شیعرەی لە ئەستۆی خۆی گرت و لە پەنای ئەوەدا کە پرۆژەی فرەی لە بەردەستدا بوو، شێلگیرانە و لەوپەڕی دڵسۆزیدا سەرجەم کارەکانی ئەم پەڕتووکەی بەوپەڕی لێهاتوویی و دڵسۆزییەوە بە ئەنجام گەیاند، هەر لە هەڵەچنی و دیزاین و پێداچوونەوە و مۆنتاژ کردن، هەتا کۆتایی.

• بەڕاستیی قەدرزان و سپاسگوزاری هەموو ئەرک و زەحمەتەکانی کاک سیامەندم و جارێکی دیکەش، بە دڵ و گیان سپاسی دەکەم و لە پەنای ئەوەدا کە کاری زۆر جوانی لە زەوینەی نووسین و وەرگێڕانی بەرهەمگەلی بەپێز، پێشکەش بە پەرتووکخانەی کوردی کردوە، بەوپەڕی دڵسۆزییەوە، هاوکات لەگەڵ نووسینی پێشەکی، ئەم کارەشی کۆتایی پێ هێنا.

هیوام وایە نموونەی فراوان بێت.

بەو هیوایە خۆرەتاوی سەربەستیی لە کەلی نیشتمانەکەم هەڵبێ، تا دوا ساتەکانی ژیانم هەوڵ ئەدەم و:

**کۆچەرێکم هەڵگری سەر، من لە پێناوی وڵات**

**ئەو مەلەم ئاکامی کۆچم دێمەوە هێلانەکەم**

حەسەن شافێعی

گەلاوێژی ٢٧٢١ ــ ئۆتاوا ــ کانادا

# گرێکی
# هەمیشە داگیرساو

ڕەنگە یەکێک لە دیاردە سەمەرەکانی «کوردایەتی»، وەک ئایدیۆلۆژی سەربەخۆیی کوردستان ئەوە بێ، کە لە سەرتاپای وێژەی کوردیدا تاقە هۆزانڤانێکمان نییە، چەندە ڕۆمانتیک و چەندە ئەویندار و چەندەش دڵتەڕ بووبێ، کوردستانی و نیشتمانی نەبووبێ. لە جوانترین هەڵبەستی دڵداریدا سۆزی نیشتمان و خۆشەویستی خاک و سروشتی زێد و بووم بەدی ئەکرێ... هۆنراوە و هەڵبەست هەموو داستانن و وێژەی بەرگری و وێژەی بەرەنگاربوونەوەن و بە پێچەوانەی هەندێ کەس، کە ئەڵێن هۆنەرمان زۆر و بۆرن؛ هیچ وانییە. هۆنەرمان زۆرن و بە هەمان ڕادەی زۆری هۆنەر، هۆزانڤانن و کاریگەری کوردایەتی و نیشتمانپەروەری لە هۆنراوەکانیاندا نەخشاوە و ڕەنگی داوەتەوە؛ بە هەمان ئەندازەش باندۆری لەسەر تاکی کورد و ورووژاندنیان بۆ بەشداری لە خەباتی ڕزگاری نیشتمانیدا هەبووە.

لەناو نەتەوەی بندەستەدا هۆنراوە و هەڵبەست بە ئاسانی

لە ناخی تاکی نەتەوەدا جێی خۆی ئەکاتەوە و گڕ و کڵپەی هەستی بەرەنگاری لە دەروونیاندا ئەهەژێنێ.

هۆنراوەی بەرەنگاری نەک هەر زۆر و بۆر نییە، بەڵکوو زۆرێکی ئەوەندە خەملاو و گەشەکردوو و ئیستاتیکایە کە هۆزانی دڵداری بە ئاستەمیش شان نادا لە شانی... هەر لە گۆران و داستانەکانی شێرکۆ بێکەسەوە تا پەشێو و تا سەدانی تر و تا ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیە:

**تاقەت، نەماوە بۆ داشتن**
**زەویی، نەماوە بۆ ناشتن**
**فرمێسک نەماوە بۆ ڕشتن**
**بەسیە،...**
**بەسیە،...**
**بەسیە کوشتن...**

وێژەی بەرەنگاری هەرچەند لە دۆخ و دارەتی سەرەڕۆیی و سەرکوتی کۆمەڵایەتیدا بەدی دێ، کەچی لە کوردستان وانییە، ڕواڵەتی زەقی داگیرکەرانەی داگیرکەر بەسەر ناخ و ویژدانی نەتەوەی کوردەوە هەمیشەییە؛ لەدایک ئەبیت و چاو ئەکەیتــەوە، داگیرکەر هەیە و، بە داخێکی گەورە و گرانەوە چەند نەوەیە بردوویانەتە بن گڵ و، هێشتاش هەیە. هەیە و، ئەوەندە بە زەقی خۆیایە کە مرۆڤی هەستیار و تێکۆشەری کورد ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی ئەو ڕۆژەڤ و ڕاستەقینە ئەبێتەوە بەسەر نەتەوەکەیدا سەپێنراوە، بووە بە لەمپەری ڕێگەی سەربەخۆیی و مۆرکی نەتەوایەتی، واتە زمانەکەی خستووەتە مەترسییەوە، بۆیە سەرتاپای هۆنراوەکانی ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیە **ڕیالیزمێکی ڕەخنەگرانەی تۆکمەیە و، لە**

**هەمان کاتدا، ڕۆمانتیسیزمێکی ئەوێندارانەی هەستۆک و خولیا و پڕ لە تین و جۆشە**... کاک حەسەن شافیعی هەر لە سەرەتای هۆنینەوەی وشە و دەربڕینی هەستی گڕگرتووی، ئارمانجی خۆی ئازادانە و بە دوور لە گوشاری دەسەڵاتی داگیرکەر، بە ئاشکرا هاویشتووەتە ناو هۆنراوەکانی. چەمکی نیشتمان و خۆشەویستی نیشتمان، لە یەکە یەکەی هۆنراوەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە و پیرۆزی ئەو ئارمانجە لە هەموو دێڕێکدا ئەنوێنێتەوە.

ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیە، چەندین ڕوانگە و شوێنەواری جیاوازی ئەندێشەیی پێوە دیارە؛ لەبەر ئەوەی بە درێژایی زیاتر لە چل ساڵ نووسراون، هەگبەی تەنها کۆمەڵێک هۆزان نییە، بەڵکوو کۆبەرهەمە... تاوێک ئەندێشەی عیرفانی پێوە دیارە و لە شوێنێکی تر خەباتی بەشمەینەتان و، لاکردنەوەی لە شێوازی نالی و سالم و مەحوی و تەنانەت چوونە بەرگی شێخ ڕەزا و پلاری بوێرانە و کەترەی[1] بەکاکڵ، هەتا چامەی نوێ و هاواری تووڕەیی و ڕەخنەی بێبەزەییانە، تا ناسکترین شنەی ئەویندارانەی تێدا بەدی ئەکرێ... بەڵام بەشی شێر، هیی نیشتمان و سەربەخۆییە. واتە پەڕانپەڕی گرینگترین بەشی ژیانی پڕ لە خەبات و کوێرەوەری و دووری و ئاوارەیی هۆزانڤان تەنها و تەنها یەک بابەتە و، ئەویش نیشتمان و سەربەخۆییە؛ کوردستانێک هەیە و یەکپارچەیە و؛ سەر و خوار و ئەمدیو و ئەودیوی هەر کوردستانە و هۆنەر ڕۆڵەی هەموو قوژبنێکی ئەم داڵدە سووتێنراوە ونجڕ کراوەیە،

---

١ - کەترە: Invective پێداخوێندن، ڕەخنەگرتن بە نەرێسات و لاتاو و کینایە لە بواری کۆمەڵایەتیدا.

کێشەکان کێشەی ئەون و بە پەژارەیان پەژارەمەند ئەبێ و بە سەرکەوتنیان ئەگەشێتەوە. بڕوای بە «کوردایەتی» هەیە و بە ڕابەری چەوساوانی کوردستان و بە هەمان پێودانگ زۆر بە وردی و تێڕادیوی پێ لەسەر مافی بەشمەینەتانی ئەم جیهانە نادادگەرە بێفرسەندە ئەچەقێنێ و، جاران و جاران پاتەی ئەکاتەوە و ئەو پەیوەندییە دیالکتیکییە بە ڕوونی ئەبینێ، کە دەسەڵاتی مافخوراوان دەستەبەری وڵاتی سەربەخۆیە.

چەند پەرۆشی پەلاماری داگیرکەرە و چەند باش زانیویێتی زلهێزەکان لە دۆمینەی ناپاکانەیاندا بە چ شێوەیەک لە دژی سەرهەڵدانی کوردن، هەرچەند هەزار ناو و هەزار چەشنن، بەڵام لە دژایەتی کورددا هەر لە کۆنەپەرستەوە تا نیۆلیبرالیستیان یەک ئامانج و یەک ڕەنگن:

**لە ئاست ئیرادەی «ڕۆژاڤا»**

**زاری بۆگەنیان ئاواڵە و**

**چاوەڕوانی هەڵلووشینە**

یان لە چامەی بۆ «ئالان کوردی» ئەو منالەی کە بەبێ ئەوەی تاڵ و شیرینی ئەم ژیانەی دیبێ، ناوی چووەتە مێژووی بێداد و ستەمەوە، یەکێک لە هەرە جوانترین هاوارەکانی گەرووی مرۆییە و، چەندە جوان و سۆزاوی ئازاری کورد، چارەی ناچاری تەرەبوون و دەرپەڕاندن لە نیشتمان بەرجەستە ئەکات و ئەیهۆنێتەوە، کە نموونەی لە وێژەی کوردیدا زۆر کەمە، کامە ئەستەم لەوە مەزنترە کاتێک کە نیشتمانی دایک ناتگرێتە خۆی و ئەتدا بەدەم شەپۆلی کوشندەی زەریای بێ بەزەییەوە:

**کەس نیشتمان جێ ناهێڵێ**

**بەڵام چ بکەی کاتێ کە خاک**

**لە هاوڕێ بوونت**

**بێزارە...**

**کاتێ**

**کە ئامێزی دەریا و**

**پیلی پێلی سامناکی زێ**

**ئاسوودەتر**

**لە،**

**کەنارە...**

هۆنەر، چاوی لە هەموو قوژبنێکی ئەم نیشتمانە ئەنجن کراوەیە، لە گردە سووری بانە بۆ شنگال و لەوێوە بۆ عەفرین و بۆ کۆبانی، بۆ سنە و ... ئەدا لە شەقەی باڵ و ئۆخژنی دڵی سووتاوی بە گرمەی هەوری هیوا ئەکا بە لیزمەی باران و گڕی ئومید بەر ئەداتە گیانی خوێنەر...

ڕەنگە زۆر هۆنراوەی کەترە و تەوسی هۆنیوەتەوە، لەمەڕ خۆشەویستی بە قووڵی دواوە، بەڵام تەنها لە یەک خاڵدا، لە ئامانج و مەبەستێکدا کە ئەویش «سەربەخۆییە»، نە گاڵتەی تیایە و نە سازان و دانووسان و نە چاوپۆشی و نە لێبوردن؛ تۆڵەی پیرۆزی پێداویستی ڕۆژەڤی کوردستانە کە خۆی لە هەردوو شێوازی پڕاکتیک و وێژەدا ئەنوێنێتەوە؛ بۆیە ئەبێ بە ئاگر، ئەبێ بە زریان، ئەبێ بە گڕکان، ئەبێ بە برووسکە، ئەبێ بە باهۆز، ئەبێ بە لێمشت، ئەبێ بە خەنجەر:

**دەبم بە خەنجەری تۆڵە**

**ڕۆ دەچم لەو دڵ و ناخەی،**

**کە خوێنی سەرخۆبوونی ڕشت**

**بەردەبمە،**

**جەستەی ئەوانەی کە هاتن**

**شەهید و خاک و پێشمەرگە و،**

**ئاڵای پیرۆزی کوردیان،**

**کوشت...**

هاودڵی و هاوخەمی دەربڕین، لە لای کاک حەسەن ئاستێکی زۆر بەرز و دڵسۆزانەی هەیە، بەشێکی هۆنراوەکان بۆ دڵدانەوە و دەربڕینی هاوسۆزی لەگەڵ خزم و کەس و دۆستانە و پڕن لە هەست و مۆژە[٢] و پەژارەمەندی:

**دڵم ئیتر بە چی خۆش کەم، کە «نیما»**

**گوڵی ژینم، لە گڵ، میوانە ئەمڕۆ**

شینگێڕی و دەربڕینی سۆزی دڵ بۆ ئازیزان تا ڕادەیەکە کە خۆی لە ڕەشبینی و بێهیوایی ئەدات، هەچەند هۆنەر بۆ خۆی تەژی ژیان و هیوایە. ئەوەی هەیە کاریگەری بەئازاری کۆچی ئازیزان بە ڕادەیەکی بەرچاو بە ناخی هەستیاری هۆنەردا ڕۆ ئەچێ:

**نازانم لەم کۆچە سوورە سەرشینەدا،**

**وەکوو دیاریی،**

**چیت بۆ بێنم؟..**

**بێجگە لە هۆنراوەی دەرد و،**

**شیعری ژان و،**

٢ - مۆژە: grief پەژارە، کۆڤان، پەرۆش، بێمرۆسی، پەشێوی، جەخار، خەم مەینەت، کوڵ، کەسەر (ع) الحزن (ف) اندوه.

ئەوسا کە دێتە سەر ئەوین و خۆشەویستی، کە بڕێکی باشی پەڕاوەکەی تەنیوە، بە فراوانی واتای وشە لە قووڵایی چەمکی خۆشەویستی تێگەیشتووە و ئەوەندە بە هەست و لە ناخەوە سەبارەت بە ئەوینی یار و ڕێزی ژن و هاوژین و خۆشەویستی نیشتمان و دۆست و سروشت و سەرجەم مرۆڤایەتی ئەدوێ، کە بە هەمان قووڵی کار ئەکاتە سەر خوێنەر و... دڵنیای ئەکات خۆشەویستی لەگەڵ ڕەوتی گەشەکردن و خەملینی کۆمەڵایەتی و داهاتووی گەشی مرۆڤ دایە، کە تەنها پیرۆز بەس مرۆڤە:

**خۆشەویستی بێ سنوور و کەوشەنە**

**بەرهەمی زانست و ئەندێشەی زەنە**

**خۆشەویستی هاوەڵی سەربەستی یە**

**ماکی ئینسان و سروشت و هەستی یە**

هۆزان دەمەوەرە[٣]، گفت شیرین و زمانڕەوانە. چواندنی جیاواز و نفت و تازەباو بەکار ئەهێنێ وەکوو:

شەلاڵی شین، کە شین دەربڕی دارەت و هەستێکی پەرێشانییە و شەلاڵبوون بە شین، لێکدانێکی سۆلان و داهێنراوە و شینێکە سەرتاپای مرۆڤ ئەگرێتەوە. هەروەها دەیان دەستەواژەی ناوازە و ناوێزەی تر:

زامستان و خەمستان،

---

٣- دەمەوەر: eloquent زمانڕەوان، زمانپاراو، قسەڕەوان، ڕەوانبێژ، تەڕدەم، قسەڕەنگین، لەبلەبان، کەسێک کە لە وەڵامدانەوەی بوێرانە و ڕەخنەی ئاشکرا نەپرینگێتەوە N veltalende ع ثرثار، لغوی، مجادل ف فصیح. هەنبانە بۆرینە ئەستێرە گەشە

شەوکەزیە، شۆرەکات، مەرگەسات،
دێمەکاڵ و دیدەکاڵ و دێمەحاڵ،
گەرمەشین، گلاژۆ، دەساژۆ، وشکەڕۆ،
نوقمینە، دڵدۆڕاوی دڵدار،
گوڵی نێو باوەشی خێوی دۆلار، گوڵی پلاستیک،
گوڵی لاسیق، گوڵی درۆ، گوڵی بێ بۆ،
گەڵخۆشانە، تالاوی زمان...

نووسەر ڕوانگەی چەپی تێگەیشتووی سەبارەت بە ناکۆکی چینایەتی و نابەرامبەری کۆمەڵایەتی هەیە، بە باشی باری لێکچووی بە ژێرخان یەک و بە ڕواڵەت جیاوازی تەراوگەی ئوروپا و ئەمریکا لەگەڵ جیهانی دواکەوتووی خۆمان شی ئەکاتەوە و، لە دووتوێی هۆنراوەی ناسکدا بەراوەردی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاتدا ئەینوێنێ کە بنەمای هەر دوو سیستەمەکە یەکە، بەهای مرۆڤ و ڕەوشتی کۆمەڵایەتی تا خواری خوار دابەزیوە، ئەمیان داگیرکەری سەرمایەداری دواکەوتەی کۆنەپەرست و ئەویان سەرمایەداری پێشکەوتووە و هەرچەند گوایە پۆزی دێمۆکرات بوون و ئازادیخوازی لێئەدا، بەلام هەمان فەرمانی جیهانی کۆنە[٤] و لەوەی کۆنەپەرستی دواکەوتوو باشتر نییە و لە ئاکامدا:

**لەم خاکە سەرلێشێواوە**

**گیرفان لە دڵ،**

**نەزان لە هۆزان و زانا،**

**سەگ لە ئینسان،**

**بەڕێزترە**

---

٤- **فەرمانی جیهانی کۆن:** Old World order فەرمانی کۆن، سیستەم و دامەزراوی سەرمایەداری و ئیمپریالیستی، کە بە سەدان شێوە و تیۆری ڕەنگالە تێئەکۆشی ڕەوایی خۆی بسەپێنێ و نکۆڵی لە مسۆگەربوونی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی بکات.

لە پاش خوێندنەوەی ئەم پەڕاوە، ئەگەر خوێنەر ڕێکەوتەکانی بن چامەکان لە بەرچاو نەگرێ، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان هۆنراوەکاندا بەدی ناکات مەگەر لە بواری خەملێنی جیهانبینی و پەرەسەندنی ناسینی کۆمەلایەتییدا، کە نیشانەی تێکەڵی قووڵ و نزیکیەتی لەگەڵ ئازارەکانی کوردستانی دابەشکراو؛ واتە هۆزانڤان لە هەمان سەرەتای گەنجییەوە بەهرەیەکی خۆڕسکی وێژەیی هەبووە و توانیوێتی ڕەوانبێژ و خۆشڕاوێژ و گوتەڕەنگین و زمانڕەوان، دێڕ بە دێڕی هۆزانەکانی بهۆنێتەوە و بیکات:

١ــ بەستەی سەربەخۆیی

**لە پێناوی،**

**سەرفرازیی کوردستانا...**

**ئەدەین بە گوێی،**

**کەڕ و نەبیستی،**

**جیهانا**

٢ــ گوتەی دڵی بەشخوراوان:

**خەریکن بادەدەن خۆتان و سەرقاڵی سەمان،**

**ئەمما!**

**بە چاوی خۆم دەبینم**

**چۆن لە شەپڵەی مەرگ تۆقاون**

٣ــ وێناندنی کەڵکەڵەی دڵی ئەویندارن:

**ئەو دەسەی ئاڵا لە دەوری گەردنی بێگەردی تۆ**

**یارەبی بشکێ، و موورادی خاوەنی گیرا نەبێ**

هۆنەر خاوەنی سۆزێکی مرۆیی باڵایە و پەرۆش و دڵسۆزی خۆی بەرامبەر بە هەموو دیاردەکان دەرئەبڕێ و پیشان ئەدات،

بەڵام سەبارەت بە هاودڵی ڕوانگەیەکی تا ڕادەیەک نەریتیانەی هەیە؛ چونکە هاودڵی بە تەنها بەس نییە و ئێمە ئەگەر بۆمان بکرێ ئەبێ دەرمان بین و چارەسەر، ئەبێ دستگیرۆ بین و یارمەتیدەر.

پەندی پێشینیان و نەزیلەی بە زۆری لە ناو هۆنراوەکاندا بەکار هێنراوە و لە دووتوێی هونەری هۆزانڤانیدا زۆر سروشتی و گونجاو داڕێژراون:

**کاڵەک بە ئەژنۆ شکاندن**

**هەی بەردی عالەم لە من بباریێ**

**خۆم کرد بە «تووڵبڕ» بێ ئاگا و خەبەر**

**مەنجەل بەتاڵە و کەوگیر، لە بنی**

**کێچێ لە کەوڵتدا بوو...**

شانبەشانی ناوەرۆک و مەبەست، لە هەڵبژاردنی وشە و دەستەواژە و هۆنینەوەیان چ لە شێوازی نوێ و چ لە شێوازی بڕگەی کێش و سەرواى پەنجەیی کوردی شارەزاییەکی وەهای هەیە، کە زۆر بە دەگمەن لە ڕێسا لای داوە، لە دژهۆنی و هاوهۆنیدا دەستی باڵای هەیە و نموونەی نفت و سۆلانی ناوازەی بەدی هێناوە:

**خوێنی منە ڕەنگی گەشت**

**بەختی منە پرچی ڕەشت**

**شێتی هەژار و بێ بەشت**

**هاواری دەردی خۆیەتی**

زۆر بە جوانی ئاوەڵناوی گونجاو ئەهێنێ و لەگەڵ وشەی

هاوتادا یەکیان ئەخات و کز و کزی و کەزیە بە واتای جیاوازی هاوهۆن و دژهۆن ڕێک ئەخات:

**ئەی دڵبەری شەوکەزیەم**

**بەم چەشنە مەدە ئەزیەم**

**کز ماوم ئەمێستا چۆن،**

**بەم کەزیە گرفتارم!**

هۆنەر شارەزاییەکی ناوازە و چاوەڕواننەکراوی لە زاراوە و بنزاراوەکانی کوردستان، وەکو هەورامی و سنەیی و... هەیە. بە ڕادەیەک جوان سنەیانە هەڵبەستی هۆنیوەتەوە، مەگەر ئەوەی هەموو ژیانت لە پایتەختی ئەردەڵان ژیابێتی ئەگینا، ڕادانی پێنووس بەو ڕەوانییە، یەکجار ئاستەمە...

هەرچەند لەم دەرفەتەدا دەرەتانی ئەوە نییە ئەم هەگبەیە شرۆڤە بکەم و لەم چەند خاڵە زیاتر بوار نییە، بەس ئەوەندە ئەڵێم کە ئەم کەشکۆڵە، گەشتێکی ئەوەندە ڕەنگنامە بە پەڕانپەڕی کوردستان و هەوارگەی دڵ و تەمتەمانی بێفرسەندی و ژانی ناکامی و... سەرەڕای هەموو ئەمانە، بە زەریالووشی ئومێد و هیوای دوارۆژدا ئەگەڕێ، کە خوێنەر نەک هەر ماندوو نابێ، بەڵکوو دڵنیام بەگوێرەی دارەتی دەروون و کەڵکەڵەی ئارەزوو، لە ڕۆژانی جیاوازی داهاتووی ژیانیدا، هۆنراوکان بەسەر ئەکاتەوە و مەزەی پێشووی بن ددانی تازە ئەکاتەوە.

سیامەند مامیر شاسواری
١٢ جوونی ٢٠٢١، کازابلانکا



# ئاهی سینەم

کە ڕووی تۆم دی ، نەما دەرد و کوڵ و خەم
چما ئەسرینی ماتەم
بە جاریێ باری کرد و غونچە پشکووت
خەنی لێو و ڕەوی تەم

پڕا عەتری گوڵاوی کاتی پەیڤین
لە تۆی دوو لێوی شیرین
شنۆی بێنی هەناسە و ماچی ناودەم
گەزۆی هێنایە بەرهەم

ئەوەی جوانی و دەلالی بوو بە تەنیا
بە بەژنی تۆوە چنیا
چلۆن بدویم لە پەسنی نەخشی دیمە و
بژ و کاکۆڵ و پەرچەم



به ناخ و گۆشت و ئێسک و پێست و خوێنم
دەمێنم تا بمێنم
چون ئێستاش هەر بە تاسەم بۆ ژوانی
چەم و کوڵم و دەم و مەم

کە چەشتەی تامی ماچی لێوی تۆ بووم
نەما هۆش و لە دەس چووم
هەزار خۆزگەم هەبوو گەردوون نەسووڕێ و
بوەستێ ، ساعەت و دەم

بەڵام ئێستا حەدیسی کەونە بۆ من
هەموو هەر خەونە بۆ من
بسووتێ ئەی تەمەن پیرت هەزار جار
بە ئاهی گەرمی سینەم

ئۆتاوا - گەلاوێژی ٢٧١٨





# ئامۆزاکەی
# گفت شیرینم

ئامۆزاکەی گفت شیرینم
خەباتی گوڵ،
خەباتی دڵ
چۆن بتوانم بڕوا بکەم؟!..
تۆ و پەنا بۆ مەرگ بردن؟!...
چۆن بتوانم بڕوا بکەم؟!..
ئەتۆ و ماڵاوایی کردن؟!..
نا، نا،
من قەت بڕوا ناکەم

تۆ لێوانلێو بووی لە ژیان
تۆ، بەهێزتر بووی لە مردن
تۆ سەرڕێژ بووی لە واتای ژین
پڕاو پڕ بووی
لە نوکتەی خۆش و،
پێکەنین

چۆن دەتوانم بڕوا بکەم
دوا دیدارە و قەت ناتبینم
ئامۆزاکەی گفت شیرینم
چۆن ئاوازی ناخی زامار،
بدرکێنم
چلۆن بڕوا،
بەم هەواڵە شوومە بێنم؟!..
چۆن کۆرپەی ژاناوی کۆچت،
لە بێشکەی دڵما، بژێنم؟!..



ئیتر چۆن زارم گۆ بکا،
تۆ بدوێنم
لە بیرت بێ...



ئامۆزاکەی گفت شیرینم
هێشتاکوو من،
هەر لە سەر وادە و بەڵێنم
بڕیار بوو ساڵی داهاتوو،
بێم و لە (هەولێر)، بتبینم
بەڵام ئێستا...
...
بەڵام ئێستا
چم لە دەست دێ؟...
ئێستا،
کە شەلاڵی شینم
ئێستا، کەوا،
زایەڵەی گەرمی گرینم
ئێستا کە زێی،

زووخاو و ژان و برینم
چلۆن بێم و،
چۆن بتبینم
چۆن بتوانم،
وادەی دیدارت نەشکێنم؟
نازانم لەم کۆچە سوورە سەرشینەدا،

وەکوو دیاری،
چیت بۆ بێنم؟...
بێجگە لە هۆنراوەی دەرد و،
شیعری ژان و،
بەستەی شینم

هیچ شک نابەم
ئامۆزاکەی گفت شیرینم
جیا لە تاڵاوی ناخ و،
دڵێکی برین ئاژن و،
دوو گلێنەی قەتیس ماوی،
سەررڕێژی تاسە و فرمێسک و،
دڵۆپ دڵۆپی
ئەسرینم...

بانەمەڕی ٢٧١٧ ئۆتاوا

بۆ خەبات شافێعی ئامۆزازای گەنجم کە دڵی
پڕ لە هیوای زۆر بە گەنجی لە لێدان کەوت و کۆچ و هۆکاری
نەمانی، بوو بە مەراق لە دڵی هەمووماندا.



# ئاشێر

کاک «مەمەد» گیان
تکایە هێند بە لای خۆتان گوێ مەسپێرە
خۆیشت بە جوانی شارەزای
ئەم سیستەم و
بێچم و نیزامە بێخێرە...
دراو دەیگێڕێ و
پێی فێرە
لێرەش هەر وەکوو لای ئێوە
هەموو شتێک،
سەرەوژێرە
لێرەش هەڵۆ گردەنشین
باز بێ لان و
چەقەڵ، شێرە

لێرەش «گا» کورسی نشینە و
مرۆڤ،

له جێی دەکا گێره
تەنیا شێواز و کەرەسه جیاوازن
بۆی دا مەچۆ
زویر مەبه ،
ئا لەم هەرا و بگره و بێره
ئەگینا سوورِ هەمان سوورِ و
ئاش هەر ئاش و
ئاشێریش ،
هەمان ئاشێره . . .

دڵدانەوەی کاک مەمەد پەرویزی
٢١ی بانەمەڕی ٢٧١٨

# ئاوەدان هەورامان

سروشت و جوانی و مۆسیقا و مێلۆدی و دەنگ و چریکه ، هەموو له ئاخافتن و چڕین و زمانی هەوراميدا کۆ بونەتەوه .
بەڕاستی هەورامی نەک زاراوه بەڵکوو زمانه و نەک زمان بەڵکوو مۆسیقا و شیعر و سیحر و ئەوین و سروشته .
من وا به ئازایەتییەوه ، پێم کردۆته نێو کڵاشی هەورامی و ئەم پارچه شیعره ، له ناخمەوه پێشکەش بەو هەموو جوانییه دەکەم .



# بارۆشه



پەنجەت باوەرۆ سای کەوان ئەبرۆ

وە تیری نیگات پەی کەر تان و پۆ

مەکیش کەر تۆتۆی پەردەی دڵ ئەوسا

وە بان ئاهێر ناز، بارۆشەش کەرۆ

ئۆتاوا، گەلاوێژی ٢٧١٨





# ئاخی عەفرین

له ژێر ناوی پیرۆزی «ژن»
ئەمڕۆ،
مێژوو تۆمار ئەکەین
له چوارقوڕنەی،
نیشتمانی ئەنجن ئەنجن
هەموو،
یەکڕیز و یەک وتار،
هەموو یەک دەنگ
هاوار ئەکەین

له پێناوی،
ئاشتی و ئازادی گەلانا
له پێناوی،
سەرفرازی کوردستانا
دوا پەیامی،
«بارین» و «ئاڤێستا» و «نەڤال»
ئەدەین بە گوێی،

کەڕ و نەبیستی ،
جیهانا
ملە و داخ و هەوراز ئەبڕین
گڕی پیرۆزی بەرخۆدان ،
دەبەینە سەر
چی ترۆپک و لووتکە و دوندە
هەر لە زاگرۆس ، هەتا قەندیل
لە ئاگری داخ ،
هەتا شاهۆ و نەکەرۆز و ،
دوندی حەمرین

بۆ ڕزگاری و بۆ سەربەستی
بۆ یەکسانی
نەک هەر جارێ ،
هەزاران جار
ئەژین ،... ئەمرین
ئەژین ،
ئەمرین ...
هەدا نادەین
هەتا دەیکەین ،

به گۆڕی هەتاهەتایی
«فاشیزمی تورک»
بست بە بستی
ئاخی ،
خۆڕاگری «عەفرین» ...

بۆ تەرمی پیرۆزی «بارین کۆبانی»
ئۆتاوا ، ١٤ی بەفرانباری ٢٧١٧

# ئاخۆ ئەو ڕۆژە کەی بێ

ئاخۆ ئەو ڕۆژە کەی بێ ، بێم بەم لە زەنگی ماڵت
کۆتا بێ ڕەنجی دووری و بینینەوەی مەحاڵت
تێر هەڵمژم هەوای کورد ، بشکێ مەراق و تاسەم
بۆی خاکی زێد بگرن ، گشت سیپەل و هەناسەم

ئۆتاوا ، بەفرانباری ٢٧٢٠





# بانه

ئەم هۆنراوە بە "بانە" دەستی پێکراوە و بە " بانە"ش کۆتایی هاتووە ..

واتا، سەر و بنی شیعرەکەم " بانە"یە. ئەو شوێنەی کە من لێی لەدایک بووم. ئەو شارەی، کە سروشت و خەڵک و خاکی هاوڕێ و پاک و دلۆڤان و بێگەرد بوون.

ئەو شارەی کە من چواردە سالی سەرەتای ژیانم تێدا تێپەڕ کرد. خۆشترین ساڵەکانی تەمەنم و خۆشترین کاتەکان. لەوانەیە زۆر کەس باسی " سەقز " بکەن. سەقز وەک بانە خۆشەویستە بۆم بەڵام بانە، لانکی منداڵی و مێرمندالی من بووە و خۆم بە دەینداری ئەو زێدە شەنگە دەزانم و هەموو خۆشییەکانی ئەو سەردەمانەم ئاوێتەی بانەیە و زۆر لە لام خۆشەویستە.

هەر بۆیە لێرەوە بە دڵ و گیان، ئەم هۆنراوە کە هەستی بێخەوشی منە، پێشکەش دەکەم بەو زێدە جوانە و دانیشتووانی.

" بانە " زایەڵەی ئاوازی ژینم

زێد و باژێڕی بە گوڵ پەرژینم

گەرووی تەنیاییم بێ گۆرانی و سۆز

کەوی پەڕیوەی بناری " بابۆز "

کۆڵان و تاخ و شاخ و باخی تۆ

هەر ئاخ و داخن بۆ ناخی بە سۆ

" سلێمان بەگ " و گوڵی زەرد و سوور

خەونێکە دێت و دەڕوا دووراودوور



" پیرمرا " و ڕەز و بەرزی " دوکانان "

بوونە مەراق و ژانی بێ ئامان

دەشتی بژوێنی پڕ لالەی " شوێ "

لە زامی تاسە و دووریمان ئەدوێ

بەرداشی باری خەفەت بێ " بانە "

هێندەی " ئاربەبا "، بارە لەم شانە

وا بە ناسۆرە برینی دووری

هەناوم کڵ بوو، نەما سەبووری

دلم پەڕتووکی ئاواڵەی " هۆن "ـە

تامەزرۆی ژوانی سەر " بانەکۆن "ـە

دەروونم کوورە و توون و گڕکانە

تەژی تاسەیە بۆ زێدم، بانە

ئۆتاوا - بانەمەڕی ٢٧١٧



# باڵە فڕووج

گلەیی دنیا لە تۆ مام بایز
کە هەمووومانت لە خۆت کردوە زیز

لە بەر خاتری بیست باڵە فڕووج
قۆناغی دخوول گۆڕا بە خرووج

بەری زەحمەتی چەن مانگ هەڵوەری
قەوما کارەسات، ڕیس بوو بە خوری

پێشتر موعجیزەی نواندبوو باڵ
سەرنج درابوو لە شێفی لاپاڵ

بووبوو بە کێڵگە گەردانەی چیا
سەریان لێک نابوو کارگ و گیا

بەڵام گووت تێکرد مەوزووعت گۆڕان
ئەو خاسە کەڵەت لە مامز تۆران



ڕووخاندت کەپری دڵیان بەو تەورە
خۆت کردە تووشی گوناحێ گەورە

چۆن دەبێ لە بەر بیست باڵە مامر
بەردەیتە جەرگی ئەو ئاسکە ئاگر؟

شوعلەی گڕی ئەو عەشقە پیرۆزە
بکوژێنیتەوە ئا بەم نەورۆزە...

چ خوا بەردارە زوڵمی وا گەورە
بۆ باڵە فڕووج ڕوو بدا لەم دەورە

ئەتۆ بەرپرسی خاڵە سەی بایز
یەک بخەیتەوە دوو دڵداری زیز

هێندە ناهێنێ چیکنوینگی حیز
کە تۆ دوو دڵان لە خۆت بکەی زیز

ئەو خاسە کەڵە بە خۆی و گورزی
ڕمی ڕەپی خۆی لێ بوو بە دەرزی

ئەوی دیش قۆخی لێ بوو بە قەیسی
قەرارە بدات بە «یوو ئێن» کەیسی

قەزیە با نەبێت بە «ئینتەرناشناڵ»
ئۆباڵ بە ئەستۆی گەلی پرتەقاڵ

فەرموو هەڵماڵە باسکی قەزاوەت
بکە بۆ دوکان ئەو جووتە داوەت

دەرکە لە دڵیان تەپ و تۆز و خاک
بۆیان ساز فەرموو چیکنوینگێ چاک



هەتا دەتوانی ئاگات لە ساس بێ
ساست باربەکیووی ڕەسەن و خاس بێ

چیلّی و سووەساید لەگەڵ باربەکیوو
تێکەڵ کە بۆیان دەنا دەتکەن سوو

نەکا هەمدیسان دڵیان لێت بێشێ
کاریان بە کۆرت و یووئێن بکێشێ

ئاوا بە زەبری ئەو ساس و وینگە
ئاوێزی یەک بن ئەو باسک و لینگە

ئەوسا ببزوێ هەستی جووتە یار
بئالێنە یەک هەر وەکوو ڕەشمار

ئەو کەڵە دەرکات شیری لە کێلان
دەست کەن بە ماچ و بە یەکتر شێلان

قەیسی هەمدیسان هەڵماسێ وەک قۆخ
لەبار بێ بۆیان هەموو بار و دۆخ

تێکەڵ بە یەکتر ببن قۆخ و شیر
پێکۆ بنووسێن وەکوو چەسپ و قیر

بەم شێوە ئەوان دەگەن بە موراد
ئەتۆش دیسچارج و دڵخۆش و ئازاد

ئۆئۆتاوا، ١٥ – خاکەلێوەی ٢٠٠٨

بەسەرهاتی ئافرەتێکە لە تەک دۆستی کوڕەکەی کە خەڵکی وڵاتی پۆرتەقاڵ بوو، پاش خواردنی باڵە فڕووج لە دوکانی مام بایز نێوانیان تێک دەچێ.

# به چیت بچوێنم ئازیزم

بەیانە و،
بوومەلێڵە و شیعری پەسنی تۆ
لە دایک بوو
بە چیت بچوێنم ئازیزم
بەچیت بچوێنم ئازیزم،
چلۆن ناخم بدرکێنم
وە چۆن شیعرم،
ببێتە تاڤگەی نەینۆک و،
بتوانم
لە ئاوێنەی وشە و چامەم
هەموو جوانی تۆ بنوێنم
بەچیت بچوێنم، ئازیزم

ستێری دیدە، مانگی ڕوو
جوانیت...
ئایەتی جادوو
وە سەوڵی بەژن و باڵاکەت



لە تاقی ئاسمان،
ڕۆچوو...
کەلی گەردن،
وەکوو میناى بێگەرد و،
چەمان دوو نێرگیزی نووستوو...
بە چیت بچوێنم ئازیزم

کوڵم لالە و، بژانگ پەرژین
برۆ،
تاقی هەزار ڕەنگی بە وێنەی پەلکە زێڕینە و
دەمت،
غونچەی نەپشکووتوو
بە چیت بچوێنم ئازیزم

خەیاڵی ناسکت وەک باڵی پەروانە و،
چەنەت،
سێوی تەڕی توردی،
بە ئاستەم،
تازە پێگەشتوو
لە ئامێتەی بزە و شەرما،
دوو لێوت هەر وەکوو خورما

له ژێر پەستانی شیرینی،
کەمێ هەڵچوو...
بە چیت بچوێنم، ئازیزم

نیگات زەریای قووڵی مەندی بی کەوشەن
زولف،
هەودای هەورێشم
شەوەڕەنگ و،
شەوەزەنگ و،
هەسارەی ڕوومەتت تێیدا،
نەخش بەستوو...
منی مەنگیش،
منی مەنگیش
لە جەرگەی بوومەلێڵی دەم بەیانیدا،
لە خەرمانەی تەماوی ئەرغەوانیدا،
لە نێو جەغزی جوانیدا
گرفتار و،
گرفتار و،
گرفتار و،
لە خۆ، ون بوو...

بەرەبەیانی ١٥ی ئۆکتۆبری ٢٠١٥، ئۆتاوا



# بێ نەورۆزم

بێ نەورۆزم
بێ نەورۆزم
هەتا تاڵانکەر و جەردەی
خۆماڵ مابێ
بێ نەورۆزم
هەتا ژانی شنگاڵ مابێ

بێ نەورۆزم
هەتا خوێنی جەستەی کەرکووک
ئاودیوی ماڵی ئاغا بێ
تاکوو نقێمی شارەزوور،
عەنبەر خاتوون
بۆ ئازاری کۆرپەی شیرینی هەڵەبجەی،
دڵ لەدوا بێ

بێ نەورۆزم
تاکوو " سەری ڕەش " کوێخا بێ
تا سەرچنار
تاپۆی تاران و بەغدا بێ

بێ نەورۆزم
هەتا دابێ وردە کوێخا
لە ئارا بێ
هەتا دەمی تەوری باشوور
بەرەو ملی ڕۆژاڤا بێ

بێ نەورۆزم
هەتا پیاو،
خودان و سالار و شا بێ،
ژن، دەستەچیلەی ئاگر و
ناتۆرەی ناو کۆمەڵگا بێ



بێ نەورۆزم
هەتا خاکی پیرۆزی کورد
سەدان پێگەی
سوڵتانی ماخۆلاوی تورکی،
تێدا بێ

بێ نەورۆزم
هەتاکوو هەوارگەی بابان
جێی بڕیار و حەسانەوەی
ئاغاکەی،
بەشی ئەولا بێ

بێ نەورۆزم
تا ئەنقەرە و بەغدا و تاران
خانەخوا بێ
کوێخای کوردیش،
لە بن فەرمانی داگیرکەر
دەست لە سەر سینگ
مەیتەرانە،
ڕاوەستابێ

بێ نەورۆزم
هەتا خەونی منداڵانی نێو کەمپەکان
ئاڵۆزابێ
بێ نەورۆزم
هەتا کۆڵبەری ڕۆژهەڵات
تەنیا بۆ هەوڵی مان و نان
پەڕۆی زاری ڕەشەبا بێ

بێ نەورۆزم
هەتاکوو بستێ خاکی کورد
لە ژێر پۆستاڵی بیگانەی
دڵڕەشا بێ
بێ نەورۆزم
هەتا بەری کێڵگەی نەوتم

بۆ قەڵاچۆی کوردی باکوور
دەسخۆشانەی " چانکایا " بێ

بێ نەورۆزم
هەتا لە سەر لووتکەکانی،
چیاکانی
هەرچوار پارچەی کوردستانم
ئاڵای یەکبوونەوەی کورد و
گڕی نەورۆز
هەڵ نەکرابێ
بێ نەورۆزم
بێ نەورۆزم
بێ نەورۆز...

ئۆتاوا - ٢٦ی ڕەشەمەی ٢٧١٧





# بێ ئۆل

چ پێویستت بە هێز و زەبر و کۆتە!
سەری عالەم لە ژێر دۆخی برۆتە
کە دادێنی بە ناز ئەگریجە چین چین
لە سەر هەر تاڵێ سەد دڵ پێوە بۆتە
بە شێوەی جوانی لەنجە و ڕەوتی شازت
هەزاران سەر لە ژێر پێت خاک و پۆتە
چ بێژم من لە وەسفی کوڵم و گەردن
سپی وەک بەفری شاخ و چۆڕی شۆتە
وە یا چاڵی کەناری لێوی ئاڵت
لە شیرنایی دەڵێی هەنگوینی لۆتە
بە دووتا دێم و دەخشێم هەر وەکوو سێ
نییە دەرووەس دڵم، گەر باس و گۆتە
تەنانەت چرکەیەک دووری لە باڵات
لە نێو جەغزی خەیاڵم خۆف و مۆتە
ئەگەر دنیا بکەن لۆمەم لە عەشقت
دڵم بێ ئۆلە، خورتە و شێتی دۆتە

**ئۆتاوا، بەفرانباری ٢٧١٦**

بۆ گەنجی ڕەوانشاد مادێح شاسواری

# بێ تۆ

دەروونم کێڵگەیە و پڕ زامە بێ تۆ
قەدم هەر وەک کەمان و لامە بێ تۆ

هەموو ڕیش و سەرم کۆلووی سپین و
نییە شەوقێ بنووسم چامە بێ تۆ

فیراقت قاقڕی کرد دەشتی گیانم
کوڵی گریان و خەم هاوڕامە بێ تۆ

دەنۆڕم چاوی بێ تینم لە ڕێتا
بە هیوای دیدەنت وا مامە بێ تۆ



دەلەرزن پەنجەکانم کاتی نووسین

دەسم بێ هێزە، ناگرێ خامە بێ تۆ

شەوان تاکوو بەیان دەس لە ملی تاسەم

کە ژین بێ چێژ و پڕ، بێ تامە بێ تۆ

خۆراکم هەر کەسەر، ئاوم خەماوە

هەمو سات و دەمم هەر شامە بێ تۆ

تروسکەی دیدەنت سۆمای چەمانم

تەنێ دڵدانەوە و هیوامە بێ تۆ

گوڵانی ٢٧١٣ ئۆتاوا

# بێ تۆیی

ئەی نیگارا پڕ بەدڵ موشتاقی دیدارم، وەرە
ئەی شەفابەخشی برینی جەرگی زامارم وەرە
من گەلێ چاوم ڕوانی تاکوو بەژنت دەرکەوێ
دەردی بێ تۆیی گرانە شەوقی شەوگارم وەرە

شیعری کۆن

# بزە

بە تیری تیژی برژانگت، خوێن دەتکێ بە باڵمدا
بەزەت لابە و بزەت بێنە، بەزەت بۆ دێ بە حاڵمدا!
بە تۆ دڵداری دڵ دارم، دڵی داماوی من خۆشە
گەزۆ بپژێنە بەو لێوە، بە ژینی ژار و تاڵمدا

شیعری کۆن . سەقز



# بەهارانی ئاویەر

ئەم شیعرە ساڵی ١٣٦٤ی هەتاوی لە سەر پێشنیاری هەڤاڵێک
بۆ سەمفۆنی ژمارە ٢ی بەهارانی ئاویەر ساز کرا.

ڕووگـــەم ئاویــــەر، جێـــــژوانی پیـــرۆز
هـــۆی بیـــرەوەری دڵـــەی پـــڕ لەســـۆز

دێتـــەوە یـــادم شـــێوەی ڕەنگینـــت
سـینەی خەمڵیـوی بەگـوڵ نەخشـینت

کەروێشـکەی ڕەوتـی سـەوزەی لاپاڵـت
گەردانـەی بەگـوڵ هۆنـراوەی یاڵـت

پـۆل پـۆل کەنیشـکی شـۆخ و لاوی قۆز
ئـاواز و هـۆرەی عەشـق ئەچڕن بەسـۆز

وا تێک ئاڵاون گوڵ و گۆناگوڵ،
دەروونی کەیلی شیعرم هاتە کوڵ

چما سەوزەپۆش باڵای ئاویەر
لە هێلانەی دڵ، ناهێڵێ کەسەر

تاسە و ئەوینی بەهارانی تۆ
ناسۆر ئەخاتە جەرگی پڕ لە سۆ

---

بەناخی کەیل، بەتاسە و مەیل، ئەناڵێنم
چەشنی بولبول، بەسۆز و کوڵ، ئەچریکێنم

بەمرواری فرمێسکی هۆنراوەی تاسەم
سای گەردنی سەوزەپۆشت ئەنەخشێنم

---



ئەو سا سەیری بەهارانت، بەژنی ڕازاوەی کوێستانت

ئاواتی کۆن بەدی دێنێ، چلوورەی تاسەم ئەشکێنێ

کاتێ خێڵی دڵدارەکان، ڕێگەئەبڕن بەرەو جێژوان

سەیری بەهاری ئاویەر، لەیاد ئەبا کوڵ و کەسەر

سەقز ١٣٦٤





# بەهاری کوردستان

ڕۆژ کە داوێتە زەوی تیشکی گەش

چاوی ژین هەڵدێ ، جیهان کەسک و وەش

شەونمی پەلک و گەڵا دەدرەوشێن

چەشنی ئەڵماس لە نێو پەنجەی تەش

سەرچڵ و پۆپ و گوڵ و دارستان

مەل و ئاواز و بزە و تام و چەش

سینگی ڕووبار پڕی وردە شەپۆل

هەستی پاراو و تەزی گەرمی لەش

نابێ تێر چاوی تەماشای تاسەم

لە نیگای دەشت و لە شاخی سەرکەش

شەستە باران و پلووره و سۆلاڤ

دەمی کازیوە ، سروشتی دڵکەش

بۆتە نەینۆکی هەور زێی ئارام

پڕ ، سەمای گرتووەتە نێو باوەش

شۆڕەبی بسکی بە پەنجەی سروە

سینگی چەم بۆی بووەتە لانک و کەش

ئاتەگ و دەشت و بنار و چیمەن

پڕ هەڵاڵە و ڕەبەنۆکی چاوگەش

ناو دڵی کانی سەمای زیخ و چەو

شایی کوێستانە ، شەتاوی چاوەش

چڕی گوڵ ڕایەخی دەشت و سارا

واری کوردە و پڕی شۆخی گوڵوەش

هەستەڕۆ مام لە ئاستی جوانییت

منی ئەوداڵی پەڕیوەی بێ بەش

ئۆتاوا ، بەهاری ٢٧٢٠



# بەڵێن

بەڵێن بێ تا بمێنم، شیعرم سروودی مان بێ

وشە و دێڕ و هەڵبەستم، هەموو هەر بۆ ژیان بێ

خامەم چەکی هەژاران لە چوار قوڕنەی جیهان بێ

ڕووگەم لە هەندەرانیش، هەر خاکی نیشتمان بێ

بۆ ڕۆژی جیهانی زمانی دایک

# بەرخۆدان

زارۆکان گەرچی بە باڵا وردن

بەڵام گشت هیوای دواڕۆژی کوردن

یەکەم هەنگاوتان ئەدا دیاری

لە ڕەوتی گەشی «بەرەو ڕزگاری»

خوێندن تاکە ڕێی ڕزگاریتانە

لێتان پیرۆز بێ ئەم بەرخۆدانە

ئۆتاوا، ٢٠٠٢



# بەسیە کوشتن

هاوار،

هاوار

خونکارانی خوێنتاڵی دراو و بازاڕ

بازرگانانی فرمێسک و،

دڵۆ وخوێن و،

ژان و ئازار...

هاوار،

هاوار

ئەی چاو چنۆکانی ڕژدی،

قەت تێر نەبووی،

" چەک " و " دۆلار "

شەڕاشۆکانی پاوانخوازی " زارۆ کۆژ "

خوێنمژانی چەواشەکاری بە ئەشق و،

ئازادی،

دژ...

هاوار،

هاوار

بوونەوەرانی بێفەڕی دز و لاسار

دوژمنانی بزە و ئەوین و سەربەستی و

گوڵ و بەهار

هەتاکەی خوێنڕێژی و کوشتار؟...

هەتاکەی خوێنڕێژی و کوشتار؟...

تاکەی، پەڕیوە و دووروڵات و،

گۆڕەشار

هەتاکەی کۆچ و تاراوگە و،

گەردن و دار

هەتا کەی کەڵاتی خۆزگەی دایکەکانمان

بێتە شۆرەکات و

ئاوار...

تاکەی باوکی ڕۆڵە کوژراو

هاواری بێ دەنگی ناخی،

لە توێی دوومانی حەسرەتا،



بدا حەشار...

هەتا کەنگێ،

گەنجی شیرینی وڵاتم

سەری سەوز و،

دڵی پڕاوپڕ لە خۆزگەی

بێ بە پارووی ژەماوژەمی

سەرشان و مار

کێ ماوە لە " کۆنە هەوار"؟...

چی ماوە لە " کۆنە هەوار "؟...

جیا،

لە چۆڵگەی خاپووری،

لێپاولێپی،

ئێش و برک و دەرد و ئازار...

بولبول نەما سیحری بەستەی

لە سەر چڵی دار ئەرخەوان

گوڵ نەماوە،

بۆ بەرۆکی، سەوڵی بەژنی،

کەنیشکی جوان

دڵ، نەماوە

کە ڕاچڵەکێ

بۆ تامی ماچی جێژوان

ئاخ نەماوە بۆ هەڵکێشان

ناخ نەماوە،

کە نەبووبێ،

بە گۆڕیچەی ئازار و ژان

شاخ نەماوە

نەبووبێ بە کێڵگەی «مین» و،

قاقڕستان

سارا و دۆڵ و دەشتم،

ڕووتن

چرۆ،

نەما بۆ پشکووتن

تاقەت، نەماوە بۆ داشتن

زەوی، نەماوە بۆ ناشتن

فرمێسک، نەماوە بۆ ڕشتن

بەسیە،...



بەسیە،...

بەسیە کوشتن...

هەتوان نەماوە بۆ سارێژ...

هەتوان نەماوە بۆ سارێژ

کۆڵبەر نەماوە بۆ گەمەی،

شێتانەی سنوور و دەسرێژ

لەش نەماوە،

بە تیری قینی پەنگخواردوو

نەبووبێ، لەت لەت و دابێژ

هەست، نەماوە

بۆوەی لە ژین،

داوا کا،

چێژ...

چاو نەماوە،

بۆ تنۆکێ ئارام نووستن...

چاو نەماوە،

بۆ تنۆکێ ئارام نووستن

بەسیە پیلان، بەسیە تاوان
بەسیە هەودای دهۆ ڕستن
بەسیە قەنارە هەڵخستن
بەسیە دەرگا،
لە بزە و خەندە،
داخستن
با چریکەی حەیران بێژم
بێ و بلاوێنێ، بەستەی ناخم
بە ڕێژن
ڕەز نەماوە بۆ سووتاندن
دارستان و باخ نەماوە،
بۆ ڕووتاندن
ڕۆژێک نەما کە شینی مە
بۆ خۆتان نەکەن بە جێژن
هیوا، نەماوە نەینێژن
خاک، نەماوە کە نەیبێژن
خوین، نەماوە کە نەیڕێژن
هاوار،
هاوار



تاقەت، نەماوە بۆ داشتن

زەوی، نەماوە بۆ ناشتن

فرمێسک، نەماوە بۆ ڕشتن

بەسیە،...

بەسیە،...

بەسیە کوشتن...

ماڵ نەماوە نەبووبێ بە مەکۆی ئازار

جێژن نەما،

نەبێ بە شینگێڕی و هاوار

ڕەنجی بێوار،

دەرد، بێ ئەژمار

هیوا و خۆزگە،!!!...

خەونێکی دووووور و نادیار...

دە با بەس بێ،

دەبا بەس بێ

خنکاندنی کانی و گیا و،

چەم و ڕووبار

دەبا بەس بێ

قەڵاچۆی شیعر و ئازادی و،

گوڵ و بەهار

دەبا بەس بێ

ماچی تاڵی فیشەک،

لە سەر،

تەوێڵی سەوزی گوند و شار

هاوار،

هاوار

تاقەت، نەماوە بۆ داشتن

زەوی، نەماوە بۆ ناشتن

فرمێسک نەماوە بۆ ڕشتن

بەسیە،...

بەسیە،...

بەسیە کوشتن...

خەرمانانی ٢٧١٧ . ئۆتاوا



# براوە

بێهوودە ئەگەر خوێنی دڵم نۆشی، نۆش
هێندەی کە ژماردم شەو و ڕۆژان، تۆ خۆش
گەر چی تەمەنم هەموو بە دۆڕان ڕۆیی
بەس شاد و براوە بووم، تۆم هاتییە کۆش

ئۆتاوا - خاکەلێوەی ٢٧٢٠

گر خون دلی بیهوده خوردم، خوردم
چندان که شب و روز شمردم، مردم
آری همه باخت بود سرتاسر عمر
دستی که به گیسوی تو بردم، بردم

هوشنگ ابتهاج ( سایه)

# بلوو تووت



لە گوێی داناوە جەمۆکە
ئامێرێکی زۆر سەیرۆکە
نە گوارەیە و نە کرمۆکە
سەری لێی سوورە ، جنۆکە

پێی دەبێژێ و پێی دەبیسێ
نە سیمی هەیە و نەڕیسێ
ئیش دەکا لە خۆر و نیسێ
هەموو کاتێک ساز و کۆکە



خەڵک ڕا دەکێشێ لە دوور
دەبەزێنێ هێڵ و سنوور
گشت پیاوێ دەکا مەجبوور
کە بۆی دابێتەسەر چۆکە

لە ڕۆژ هەڵات و ڕۆژئاوا
سەدان دڵی بۆ قرچاوە
هەمووی لە وەیتینگ لیست ناوە
یەک یەک دەکەونە فاقۆکە





ئەم ئامێرە سیحراوی یە
ناوی ددانی ئاوی‌یە
وەک دەنووکی مراوی‌یە
ئەندازەی دوو قەدی نۆکە

ئەوەی پرۆگرام نازانێ
دەیکێشێ بەرەو دوکانێ
فێری دەکا شان بە شانێ
چۆن ئیش کا بەو ئامێرۆکە




هەر وەکوو داوێ تەنراوە
لە چەشنی باوە و گێژاوە
سەد ئاشقی پیا نووساوە
وەکوو تەونی جاڵجاڵۆکە

یەک یەکی ئەو نێچیرۆکە
کەوا گیرن لەو تۆڕۆکە
ئامادەن بۆ ئەو بەرۆکە
خەڵات کەن سەر و ماڵۆکە






هەموو هەیانە پرسیار
سەر و دڵی دەگرن زۆر جار
ئەو فێر کار و ئەمان فێریار
بە ئامێری خاڵخاڵۆکە

خاوەنی ددانی ئاوی
بە خۆی و تۆڕی تەنراوی
شانازە بە دانە و داوی
جار جار خۆی دەکا تەنگۆکە

دەڵێ: ئەوە منم، شەنگم
سەیری کەن برۆی مەلەنگم
بڕوانن چاوی قەشەنگم
گەردنم بەرز و زەردۆکە

زۆڵفم هەر دەڵێی هەودایە
بەژنم وەک سەوڵی تەڕ وایە
ڕوومەتم لالەی سەحرایە
هەمووتان دەکا حۆلۆکە

لێی کردوون کار ئەم شتگەلە
بۆیە ئاوەها بەپەلە
بۆ فێر بوونی ئەم بێ تەلە
دەشکێنن ئەستۆ و ملۆکە

باش ئەزانم نیازتان چەس
تەشریفتان لێدەدەن جەرەس









جیا لەتۆ شک نابەین کەس
فێرمان کا ئەم ئامێرۆکە

دێن بە بیانووی بلووتووت
خۆتان و میتر و نیوێ لووت
بۆ سەیری برۆی تاق و جووت
ڕووتان ڕەش وەک مەنجەڵۆکە

وەک ئەو سەلاحە سەرگۆڵە
بەو هیوایە دوکان چۆڵە
ئەو هەتیوە مل ڕیخۆڵە
زوو زوو دێنێ تەشریفۆکە

یان بۆ تەعمیری ساتێلایت
یا تەنزیمی سیگناڵ و لایت
موزاحیم دەبێ لێفت و ڕایت
عەبدوڵڵای دەست و پەنجۆکە

یەکێ پاقلاوەی بۆ دێنێ
ئەوی دی کافی دەسێنێ
یەک هەر مردووەو نامێنێ
لە بۆ ئەو باڵا و بەژنۆکە








هەموو ئاشقگەل لات و لووت
دێن دانەدانە و جووت بە جووت
کە دێن دەبینن خاڵی ڕووت
چاویان دەبێ بزبزۆکە



بە کورتی، مەکۆی دڵانە
خۆی شەنگ و ئامێری جوانە
یاری دەکا بەو حۆلانە
هەر بە وێنەی خولخولۆکە



هێند سووڕاون هەموو گێژن
نازانن ئیتر چی بێژن
مەگەر هەروا قوڕ بپێژن
لە سوێی ئەو بەژنە گردۆکە

ئۆباڵ بەو ئامێرە نەختە
دەبێ هەر بدەین لە تەختە
بۆ ئەو بیرە جوان و پوختە
هەستا لە مێشکی جەمۆکە

١ ی جوونی ٢٠٠٨





# بۆ: مارکس

مەزنترین دیاردەی مێژوو،

لە دایکبوونی مرۆڤێ بوو

کە بۆ،

هەمدیسان یەکبوونی

مرۆ و سروشت،

تاپۆی مێژووی هەڵدایەوە

ڕێسای دراوی بژار کرد

دهۆی باژێڕی بازاڕ و

فێڵی پارەی،

پەرچ دایەوە...

تۆرەنتۆ، ١٤ ی مارچی ١٩٩٢

# بۆ دادە فاتم

ژانی کۆچت ئاگری بەردایە سینەم، دادەکەم

چاری چۆن دێ ئاگری ئەو گەرمە شینەم، دادەکەم

تۆ دڵێکت بردە تۆی گڵ، کانی مێهر و شێعر و گوڵ

چۆن دڵم خۆش بێ ئیتر بەم کەکرە ژینەم، دادەکەم!

١٠ی گەلاوێژی ٢٧١٨، ئۆتاوا

# بۆ دینیز

«دێنیز» هەر نەک سەگێ، بەڵکوو «بەگ»ێ، بوو

لە لەشما، خوێن و ئێسقان و «ڕەگ»ێ، بوو

کە باری کرد و جێی هێشتم بە تەنیا

ژیانم، ژانی پایزە «وەگ»ێ، بوو

ئۆتاوا. ڕەزبەری ٢٧١٧

دینیز: ناوی سەگەکەی کاک ڕامین مەرزبان بوو کە لە ژیاندا نەما.



# بۆ ژاکلین

چی بکات خاڵۆ

کە ماتە

قەڵەم و نووسینی

چۆن بکا

تاکوو بڕێ ئارام بێ،

دڵی پڕ مێهر و وەفای،

خوشکەزای،

شیرینی

قەت لە خەونیشا ئەمن ناتوانم

پی بنێمە شوێنی

جێگە پێی،

باوکی دلۆڤانی تۆ

وا قەڵەمڕۆمە،

لە ئاستی،

ژانت

خوشکەزای شیرینم:
چی بکەم،
تاکوو بڕێ سووکتر بێ
باری ئازار و،
خەمی سەر شانت
هەر ئەوەندەم دێ لە دەست
بێم و بتبینم و،
بۆ چەن چرکە
ببمە یەک زەردە
لە سەر،
لێوانت
تا لە ناخی دڵەوە شاد بیت و،
وەکوو ئەستێرە،
لە ئاسمانی گوڵ و شیعر و ئەوین
پێبکەنن،
چاوانت...



بۆ ژاکلینی خوشکەزام...

ئۆتاوا، ١٠ی خاکەلێوەی ٢٧١٨

# بۆکاك

# جەمالی ڕەزازی

ئەوەی لە نێو هەناوتایە

گشت دڵسۆزی و

کوڵ و کۆیە

ئەوەی لە سیماتا دیارە

نەک ڕیش و موو

هەموو

هەر شەکر و گەزۆیە

نیشتمانیش،

چاوی گەش و دڵی ڕوونە

چون خاوەنی

جگەرگۆشەی وەکوو تۆیە

۱۲ی بەفرانباری ۲۷۱۵



## بۆ کێلی گڵکۆی «نیما»

چەمانم چاوگەیی گریانە ئەمڕۆ

هەناوم کانی دەرد و ژانە ئەمڕۆ

دڵم ئیتر بە چی خۆش کەم کە «نیما»

گوڵی ژینم لە گڵ، میوانە ئەمڕۆ

بە بۆنەی مەرگی لە ناکاوی نیمای ٢٠ ساڵان

خەرمانانی ٢٧١٧

## تشت

یەکێ دەرد و یەکێ هەتوانە داوای

یەکێ وەسڵ و یەکێ هیجرانە ماوای

لە دەرد و وەسڵ و هیجران و لە هەتوان

من ئەو تشتەم دەوێ، دڵدارە هاوای

ئۆتاوا، بەهاری ٢٧١٦

وەرگێڕاوەی دوو بەیتییەکی باوەتاهیری هەمەدانی



# بۆ: لێنین

لە ئاسۆی ئاشتی و ئازادی و ئەڤین
هەڵات هەتاوی یەکسانی و ڤەژین

نێڵەی ئاگری شۆڕش چین بە چین
دنیای هێنایە گڕ و تاو و تین

ڕما کەلاتی هەژاری و نەژین
لە سای بورکانی وزەی ڕاپەڕین

ڕەز، بەری هێنا لە ڕەزبەری ژین
بە ڕیچکەی ئاپۆی هەژاران، لێنین

ڕەزبەری ٢٧١٧ ، ئۆتاوا

## بۆ مامۆستا

## فاتێح موحەممەدی

# (نامۆ)

هەر چەن لە ئاست شکۆی چامەت، پشتی وشەم،

لامی لامە..

لە ڕووی دۆی نازداری شیعرت، پەسنم هەموو،

وشەی خامە...

بەڵام لە سای چۆڕی شیلەی، پەرجۆی هەڵبەستی شیرینت،

ئێستا ئیتر ئامۆی «نامۆ»م، شیعرم، پڕی

چێژ و تامە...

ئۆتاوا، سەرماوەزی ٢٧١٧



# بۆ: نیما.

سەیری هەر سووچی ماڵ ئەکەم
وێنەی " نیما "
لە چاوانما چرۆ دەکا و
دیمەی خەیاڵ دەخەملێنێ
ئەو دەمانەش،
کە خەم لانەی دڵ دادەگرێ
شنەی یادی
هەرچی تەمی تەنیاییمە،
دەڕەوێنێ
ئاخ " نیما " وردیلانەکەم
یادت
هەموو دنیا دێنێ...

ئۆتاوا، گوڵانی ٢٧٢٠

بۆ: خاتوو نەسرین و کاک زاهید بە بۆنەی ماڵاوایی سەگەکەیان کاک " نیما "، لە ژیان

# بۆ شنگال

له باتی ئاو
هەر چی فرمێسک له کاڵانەی چاومدایه
تا دوا دڵۆپ
تا دوا ڕنوو
بۆ شنگاله نازدارەکەم
بۆ ئاپۆرەی کوڕ و کاڵی سەر چیای له تەمدا ونبوو
بۆ ئەو گوڵه زارۆکانەی
وا هەڵوەرین و
ویژدانی بێ ویژدانی هەموو دونیا
له ئاستیدا
کرِ و نووستوو...

گەلاوێژی ٢٧١٤ - ئۆتاوا





# بۆ سنە

نەک تەنیا هۆزی هەڵۆ و ئەردەڵان
بەڵکوو چوار پارچەی خاکی کوردستان
چی تاکی کوردە یەکدڵ و یەکدەس
ئەمڕۆ ڕووگەیان سنەی مەستوورەس

ئۆتاوا، پووشپەڕی ٢٧١٨

# بۆ عوسمان

وا مەل سەرخۆشەن لە عەتری گوڵزار
منیش سەرخۆشی نەشئەی بادەی یار
مەستەن عاڵەم گشت لە پەیمانەی مەی
منیش سەرخۆشی پەیمانەی دیدار

ئۆتاوا، ١٥ی گوڵانی ٢٧١٩
وەڵامێ دەم و دەست بۆ عوسمان تۆپچی

# بۆ گڵکۆی
# سیامەکی جوانەمەرگ

کورم ڕۆڵەی مێشک پرژاو،

جەرگ پارەی سینگ هەڵدڕاو

کۆچی سوورت چەن ئەستەمە

بۆ دایک و بابی دڵسووتاو

*******

دیسان لاوێکی بووک نەدیو،

گڵکۆی سارد گرتییە باوەش

دیسان گڵی بێ بەزەیی

بەژنی گوڵێکی نایە هەش

خوناوەی فرمێسکی خوێنین

لەپاش کۆچی سوورت پێشکەش

سەقز - ١٣٦٢



# بۆ خالیدی هاوڕێم

بۆچی وا پارێز ئەکەی ناوێری ناخت دەربڕی
دڵنیام ئێستاش لە خۆزگەی ماچی ئەو لێوە پڕی

نەک بە تەنیا خاڵە «ئیرەج» بەڵکوو گشت نێری زەوی
چاو دەقوونجێنێ کە مەمک و سمتی وا بێتە خەوی

خۆت مەکە لێمان بە سۆفی دڵتەڕی هێشتا جەوان
دڵنیام دەستت بگات، نایدەی بە قەرزی یەک شەوان

جۆزەردانی ٢٠١٨ ، ئۆتاوا

لە وەڵامی وێنەشیعرێکی " ئیرەج میرزا "
شاعیری فارس‌دا نووسیم بۆ هاوڕێم خالید قانعی

# بۆ خۆشەویستم

ماڵی دڵمت شێوان
ئەی شاهی شەکەرلێوان
کەوتوومە کەژ و کێوان
لوتفێ بە دڵی زارم

پابەندی تەلی مووتم
یەخسیری گولی ڕووتم
ڕەحمێ بکە وا سووتم
لەش زام و بریندارم

بێ زەردەخەنەت زەردم
ئاڵۆزی خەم و دەردم
وەیلانی کەژ و هەردم
لاواز و کز و زارم

چاوی گەشی پڕتینت
زولفی ڕەشی پڕچینت







چین چینی لەسەر چینت
لەم چینە کە ڕزگارم

دلتەنگی دەمی تەنگم
داماوی دڵی سەنگم
ئەی سەوڵی شل و شەنگم
تۆی هەیڤی شەوی تارم



ئەی دڵبەری شەوکەزیەم
بەم چەشنە مەدە ئەزیەم
کز ماوم ئەمێستا چۆن،
بەم کەزیە گرفتارم!

هەڵبەستی ئەمن ئەوڕۆ
بۆ تۆیە هەموو بۆ تۆ
بڕوا بکە من بێ تۆ
ڕۆڕۆیە هەموو کارم



بەندیخانەی لەشکری ٦٤ی ورمێ
١٣٥٦ی هەتاوی

# بووکی کەرکووک

نێڵەی گڕی «بابە گوڕگوڕ»، ئەمڕۆ بە گوڕ ئەگرمێنێ
مۆژدەی لەدایکبوونی کوڕی، تۆڵە و خوێن و ئاگر دێنێ

کەنیشک و خورت و پیر و لاو، خوێنی پۆڵا لە دەمارن
بۆ کەرکووکی ڕووگەی کوردان، هەموو مامە ڕیشەی شارن

ڕۆژی تۆڵەی خوێن و ژانی شنگال و کۆبانی و کەرکووک
هەڵات لە ئاسۆی گەرمێنی، دەشتی خوێن و گڕ و گوڵووک

زاوای سەربەرزی و ئازادی، چەک لە شان و چنگ بە گڕە
بۆ خەڵاتی بووکی کەرکووک، لە هیوای سەربەستی، پڕە



ئۆتاوا، ٢٦ی ڕەزبەری ٢٧١٧

# بوومه لەرزە

کورد، هەر هاتوو سەربەخۆ بێ،
هەموو دونیا لێی هاتە دەنگ
هەر چوار دەوری بوو بە ئاگر
کەوتە بەر هێرشی چەک و،
ڕەشەبای جەنگ
لە گەرم و سارد
چی هاتە ڕێی،
هەمووی بوارد
هەر خوا مابوو
ئەویش،
بوومەلەرزەی
بۆ نارد...

ئۆتاوا ٢٠ی خەزەڵوەری ٢٧١٧
بە بۆنەی بوومەلەرزەی ٢٠ی خەزەڵوەر

# بووش و باییز

له کۆشکی سپی سەرەتای پاییز

سەری له بووش دا مامۆستا باییز

مامۆستای ئازیز بە گردی و وردی

بووشی موعجیب کرد بە بەرگی کوردی

فەرمووی بەخێر بێی پشتوێن شەش گرێ

جامانه سووری چاو دەنکە ترێ

تەشریفت هەموو هەر خێر و بێره

بەژنت وەک باز و دەنگت چون شێره

له کۆشکی سپی هەتا پێنتاگۆن

عالەم چاوەڕێی سەیری بالآی تۆن

دانێڵد و چەینی لەگەڵ هاوڕێ گەیت

شایی دەگێڕن بە گۆرانی و بەیت

وا ڕایس سەرقاڵە بە دوو دەسماڵە

تا بۆی فڕێدەی ئەو شەش قەف شاڵە

بەڕاستی کردت ئەمریکا گەورە

بەو بەرگە جوانە و بەو گووپە چەورە

پێم خۆشە پرسێ ئاڕاستەی تۆ کەم

نانێ حەواڵەی ئەو ماستەی تۆ کەم



ئەتۆ چۆنە کە ئاوەها فیتی ؟

هۆی چییە کە وا بە کەیف و قیتی !

ئێستاش هەر دەڵێی هەڵۆی کوێستانی

کەسک و زەرە و سوور، دەڵێی بێستانی

کەوشەکەت لە کوێ بۆیاخ کردوە

بۆ وا خۆت لێمان قاچاخ کردوە !

بۆچی سەرنادەی هەر سێ مانگ جارێ

پەڵەیەک بدەی، ڕەحمەت بباریَ

گەلی ئەمریکا چاویان لە ڕێتە

ژنگەلی ئێرە هەمووی بۆت شێتە

هەموو چاوەڕێن بتکەن زیارەت

دابمەزرێنن سەودا و تیجارەت

تا بەڵکوو خێرت بگات بەم خاکە

دەوڵەمەند ببن چی گشت و تاکە

وەڵامی داوە مامۆستا باییز

کریستاڵ کلێر، شەفاف و تەمیز

فەرمووی کاکە بووش برای ئازیزم

مێوژ و گوێزی شەوی پاییزم

دیارە کردبووم ئەمن تاسەی تۆ

ئاگادار نەبووم ئا لەم باسەی تۆ

بۆیە من هاتم ئەورۆ بۆ ستەیت

هەتاکوو بکەین پێکەوە دیبەیت

بدۆزینەوە لە بۆ " گەنجە"ی کورد

ڕێگاچارەیەک زۆر بە دەستووبرد

خاتوو ڕایس بکەین لە گەنجە مارە

بۆ پەیوەندیمان، هەر ئەوە چارە

ئاوا نە گونی گەنجە ژەنگ دێنێ

نە خاتوو ڕایسیش تەنیا دەمێنێ

بەم ئیشە دەبن هەردوو سەربەخۆ

چیتر نامێنن دیل و ڕەنجەڕۆ

دوکان، ئۆتاوا، مانگی مەی، ٢٠٠٨

لەسەردانەکەی بارزانی بۆ لای بووش، شۆخییەک بوو کە
لەتەک مامۆستا باییز و کاک گەنجە کردمان.

# بە کاتی دڵ

بۆ برای هەستیارم مامۆستا

"حەسەن شافێعی "



بە کاتی دڵ، لە سەققز تا ئۆتاوا

سڵاوت لێ برای ژیری دڵاوا

بە ئەو هیوا تەمی دووریت نەمێنێ

هەموو هەرچی خەمە بیدەی بە ئاوا

لە یەک کۆ بینەوە، دڵشاد و ئازاد

بە نامۆیی نەژین قەت ئێمە ئاوا

نەچێژین مەرگەژاری پڕ مەخابن

لە ناو بیری ڕەش و دەستی گڵاوا

دەس و بیرێ، بەوان گۆشت و برنجین

لە ناو قازانی خۆرشت و پڵاوا

محەمەد فاتێح محەمەدی «ف-نامۆ»



# وەرامێ بۆ مامۆستا " نامۆ "

سەد چەپکەی سۆز و سڵاو و ڕێزم
پێشکەش بە (نامۆ)ی ئامۆی بەپێزم
پەی بەرامەی وەش، وەرام شیرینت
شنۆی نەسیمی چامەی زەنگینت،
چلوورەی تاسەم، سەرجەم تیواوە
کە پەیکی لوتفت هات بۆ ئۆتاوە
چەم ڕووناک، دڵ وەش، ئازارم ڕەوین
کە بێنی شیعری " نامۆ "م هاتە بین
دڵم ئایەنە لە دوارۆی شیرین
لە دەوری " هەڵۆ " و ڕیزی هەڵپەڕین
تۆ سەرچۆپیکێش، منیش گاوانی
بۆ ئازادی و گوڵ، بچڕین گۆرانی

ئۆتاوا، ١٥ی سەرماوەزی ٢٧١٧



# « چاو »

لێم دەپرسی : بۆچی وا نوقمی لە دیمەی تاوی من
وا ، کە ناترووکێ دەمێ چاوت لەسەیری چاوی من !
چاو لە یەک نانێم بە چرکە ، تا بە چرکەش دەر نەچێ ،
غەمزەکەی نێچیری چاوانت لە بۆسە و داوی من

وەرگێڕان لە فارسییەوە بۆ کوردی
ئۆتاوا - گەڵاڕێزانی ٢٧١٨



گفته بودی که چرا محو تماشای منی
آنچنان مات که یکدم مژه بر هم نزنی
مژه بر هم نزنم تا که ز دستم نرود
ناز چشم تو به قدر مژه برهم زدنی
«فریدون مشیری»

# چەپی ئەمڕۆ

چەپی ئەمڕۆ

لە نێو گۆڕەپانی «مۆدە» و

لە شیلەی «فەشن» خنکاوە

بە پانتایی ئەم جیهانە

هەر بە تەنیا

مێزەرەکەی فەلەستین و،

کڵاوی جووی لە بەر چاوە

بەڵام لە ئاست،

کورد و عەفرین و کۆبانی

کەڕ و لاڵ و،

بێ دەسەڵات...

کپ و،

مێشکەڕۆ و،

خەساوە...



ئۆتاوا، خاکەلێوەی ٢٧١٨

# چی بنووسم؟

بۆ ئەو مێرمندالەی کە، لە «کازروون» پاش دەستدرێژی سیکسی، تەرمی بچکۆلانەی لە ژێر پردێکدا دۆزرایەوە

چی بنووسم؟

چلۆن دەستم بگرێ خامە!

پەنجەکانم دەزیرڕێنن

خوێن دەتکێ لە شیعر و

چامە

هێندەی چاوی سەرنج بڕکا

بست بە بستی زەوی،

زامە

کوا دڵی خۆش واتای ماوە؟

هەر چی زار و دەم و لێوە

بزە و خەندەی

لێ تۆراوە

زامستانێکی غەریبە



ڕێسای دراو، مۆتەکەی شەڕ

باڵی شوومیان

بە سەر دنیادا کێشاوە

بۆ هەر سووچ و

قوژبنێکی ئەم جیهانە

گوێ ڕادێری

هاواری ناخی هەژار و

کسپەی دڵی لێقەوماوە

تووڕەم، تووڕەم

خوام نەماوە

هەناوم بۆتە گڕکان و

دەمی جخار تاوی داوە

کە دەبینم

مێرمنداڵی دە دوازدە ساڵ

تەرمی بچکۆلانەی وردی

بە خاچی داوای شەهوەتا،

داکوتراوە...

ئۆتاوا، سەرماوەزی ٢٧١٨



# چل ماچ

چل چەپکە گوڵ
چل ماچی تەڕ
چل نێرگز و چل هەڵاڵە و
چل لەیلووپەڕ
چل چەپکە ڕێحانەی بۆنخۆش
چل مێلاقە و چل بەیبوون و
چل گەزیزە و
چل شللێرە و،
گوڵی دڵ و خۆشەویستیش،
چل هەزار کۆش
پێشکەش بە تۆ و
بە ئەوینت
بە لێبوردوویی و،
بەخشینت
بە بزەی گەرم و
شیرینت
بە ڕوانینی ئەرخەوانیت
بەو دڵە نازدارەی سەرچاوەی دڵداری و



دلۆڤانیت
به خوێن شیرینی و
به جوانیت
له تەک تۆمه
له تەک تۆمه
ئەی که مانگی و
له ئاسمانی دڵما نەخشی
که تۆ هاتی ...
دنیام گۆڕا و
هەموو دەورم پڕ نیگار بوون
هاتی و هەموو وەرزەکانم ،
گەلێ شیرین و نازدار بوون
لەگەڵ تۆدا و به بوونی تۆ
هەر بەهار بوون
هەر بەهار بوون
هەر خۆشەویستی و ئەوینی
بێ ئەژمار بوون
ئەی هاوڕێی تاڵاو و شەکراوی
ژیانم
ئەی دڵسۆزترین هەڤاڵی
ساڵ و مانگ و
وەرزەکانم

ئەی لەمپەری ،

تەم و خەم و ڕەنجەڕۆیی

ئێستا دەزانم کە چل ساڵ ...

لە سای ئەوینی بێگەردت

چلۆن ڕۆیی

ئێستا دەزانم مەحاڵە

یەک خولەک

نا ... نا ..

یەک چرکەش

ژیان و

ژینی بێ تۆیی ...



ئۆتاوا ، جۆزەردانی ٢٧١٨

# چرۆ

چرۆی نەپشکووتووی سەرچڵ چۆن دامرکێنم سۆزی دڵ

چۆن نەگێڕم شینی بە کوڵ کە وا چوویتە ئامێزی گڵ

با خوناوەی فرمێسک و خوێن دابڕێژم بە کۆی گڵتا

کە وا لە تۆی گڵا گلا ، هەزار ئاوات لە تۆی دڵتا

سەقز ، ١٣٦٠

بۆ گڵکۆی خۆشەویستێک

# دایکە

«دایکە»، واتە دایکم، بە فراوانی هەمووماڵباتی ئێمە کە چڕ و فراوانین، ڕووگە و خۆشەویست بوو. هەموو، بە «دایکە» ناویان دەبرد و پاش ئەوەی کۆچی دوایی کرد، زۆر جاران تەلەفوونیان بۆ من دەکرد و دەیانگوت کە دایکت هاتووەتە خەومان و هەواڵی تۆی پرسیوە و بۆت دڵ لەدوایە. ئەم بەندەی خوارەوە لە سەر ئەو بابەتە چێ کرا و پێشکەشی دەکەم بە ڕەوانی سەوزی دایکم.

دایکە:
خۆشەویست ترینم
شەو نییە چاو لێک نەنێم و
لە خەونمدا،
تۆ نەبینم
ئێستاش لە پاش دوایین کۆچت
هەر،
دڵ لەدوای
هەموو شەوێ
لە خەونی هەموو کەسێکدای
لە هەر ماڵێ
مۆمی وەنەوزێ داگرسێ
دەڵێن دایکت دێتە خەومان
هەر،
هەواڵی تۆ دەپرسێ...

ئۆتاوا، ٣ی ڕەزبەری ٢٧١٨

# دارســـتان

هەموو دنیا دارستانە و
یاسا،
تەنیا ڕێسای کوشتن
چلۆن دەتوانی چاو داخەی
لە سێدارە و
لە خوێن ڕشتن
چۆن ناتەقێی وەکوو گڕکان
کاتێ هەر چوار دەورت گورگە و
کەڵپە و ددان
سەریان قاڵە بە کرۆشتن!

چیتر مۆلەق ڕامەوەستن
ئەم زوحاکە،
لە جێی دوو مار
هەزار ماری لە سەر شانە
فریاکەون
ڕابن،



هەستن
پێش لەوەی گەنجمان نەمێنێ و
وڵات
ببێتە وێرانە ....

ئۆتاوا، خەرمانانی ٢٧١٨

بۆ: ڕامین و زانیار و لوقمان و...

# داو

بەرەو ئورووپا خۆت لێ کردین ون
گوایە دەتەویست لەوێ بێنی ژن
لەم داوە هەموو بە مل پێوە بووین
بەڵام تۆی ئازیز پێوە بووی بە گون

ئۆتاوا، ساڵی ٢٠٠٩

بۆ هاوڕێیەکی خۆشەویست




# دەنووکێن

**دەنووکێنی نێوان**
**کاک سیامەندی شاسواری و حەسەن**
**شافێعی لە ڕێکەوتی سەرەتای ساڵی ٢٠١٧دا،**
**وەکوو یادێک دەمێنێتەوە لە پێناوی**
**دیالۆگێکی شیعریدا.**



## نەخۆشینی قەند

بە فێڵ و کەتــرە و نـزا و ســوێند و پەنـد
زۆر جـاران ماچـم لـەو لێوانـەی سـەند
هێنـدەم هەڵمـژی شـیلەی شـەکری لێـو
تـا چوومـە خانـەی نەخۆشـینی قەنـد
ح.ش

## بۆ کاک حەسەن

تــۆ بــە لێــو مژیــن گرتــت شــەکرە و قەنــد
ئـەی گوتـەت شـەکر و دیاریـت وەکـوو قەنـد
منێــک کــە هەمــە نەخۆشــینی قەنــد
لــە پــاش لێومژیــن ئەگەمــە کام لەنــد؟!
س.ش

## بۆ کاک سیامەند

گـەر بێتـوو بمـژی شـیلەی لێـوی ئـاڵ
شـەکرە و قەنـد و مەنـد گشـت دەبـن بەتـاڵ
دەوای حـەوت دەردە گـەزۆی کوڵـم و لێـو
بـەو مەرجـەی خۆتـی تیـا بکـەی شـەلاڵ
ح.ش



## زیادەڕەوی

مەرجـم ڕاپەڕانـد وەک شـەوبێداران لای یـاری کـەوی
وەکـوو دەرمـان بـوو مژینـی لێـو و لیمـۆی پتـەوی
کەچـی شـەکرەکەم سـەرەڕای ئـەوەش ڕوو لە حـەوا بوو
هـۆم نەئەزانـی، دیـارە کردوومـە مـن زیـادەڕەوی
س.ش



## بۆ زیادەڕەوی

دەرمان لە لێو و کوڵمی وەک قەندە
تۆ لە بیرت کرد پەندەکەی بەندە
چووی بەرەوخوارتر بۆ باغی لیمۆ!
بۆیە شەکرەکەت ڕێژەی بڵندە
ح.ش



## پەلامار

ئەم وڵامەیان زۆر دەستوبرد و ئەڵێی زەڕکەفتە
وەکو بزانی پەندی پیرانەت مایەی گرفتە
دەرگای باغی بەی، پەرژینی لیمۆ، چەند توند و تۆڵ بێ
خۆی ڕاناگرێ، پەلامار ئەدات دڵەی لاکەفتە
س.ش

## بۆ پەلامار

کاتـی کـە ئەڵێـن «ماڵتـی ڤایتامیـن» ئەمـە زۆر ڕوونـە هەر بەشێ لە لەش، سەرچاوەی جۆرێ دەوا و مەعجوونە مژینـی "لیمـۆ" دوچـارت دەکا بـە "«کامپلیکەیشـن» بۆیـە پاوانـە بۆ تووشـبووی قەند ئەم بەرەوخـوار چوونە!

ح.ش

## شێتخانە

دەمێکەیـە دڵ، لـە "کامپلیکەیشـن" چـوە بـەو لاوە دواپشـکنین ئـەوەی دەرخسـتە، تـەواو گـۆڕاوە سـێ جـۆری شـێتی، ژیـری و ئـاوەزی ناوەتـە لاوە مەگـەر شـێتخانە، ئەگینـا تـازە کەڵکـی نەمـاوە!

س.ش



## زۆر بەداخەوە

ئەمن پسپۆڕی میوە و شیرینیم، برای شیرینم
شارەزای باخ و بێستان و ڕەز و شانەی هەنگوینم
کە هاتە باری دەروونی تۆسەن، من بێ جەوازم
زۆر بە داخەوە، لەم گۆڕەپانە منی تێدا نیم
ح.ش



## هۆمیۆپاتی

ئەو هۆکارەی کە مرۆڤی ساغ نەخۆش ئەخات
هەمان هۆکارە شێتی دەغەزار چاکەوە ئەکات
کە وا بوو بۆ من، ڕەچەتەی یەکەم دەرمانی دەردە
چونکە دڵنیام، شیلەی کوڵم و لێو شەکرەم لائەبات
س.ش

## بۆ هۆمیۆپاتی

خۆشحاڵم بەوەی ڕەچەتەی یەکەم بوو بە دەنووکێن

خەفەتی ڕەواند لە دڵی ئەوانەی لەو دۆزە دەدوێن

تۆی هێنایەوە بازنەی شەکراوی گۆنا و لێوی ئاڵ

بوو بە هۆکاری بەرهەمی جوان و هۆنراوە خوڵقێن

ح.ش



## ژیانەوە

گەر وەک "ئەدۆنیس" ساڵی چوار مانگان بێمە سەر زەوی

چون وەکوو زیندان بۆم هەژمار ئەکەن هەم ڕۆژ و شەوی

لەلام کەم نییە، دەم لە ناو دەمی گۆناگوڵگەزی "ئافرۆدێت"ەکەم

ئەیژیێنمەوە ئەیکەم بە بەهار، گوڵ لە دارستان، خونچە لە دەوی

س.ش



## بۆ ژیانەوە

لە وڵامی نوێتا هیوام بەدیکرد خەنی بووم، خەنی
زایەڵەی خۆشی دڵداریت بە گوێی عالەمدا ژەنی
لە بری ئەدۆنیس، "سیامەند"یْ بە بۆ "خەج"ی نازدار
خۆت شەڵاڵ بکە لە شیلەی گەزۆی دوو لێوی قەنی
ح.ش



## یادەوەری

لەم ژانووسەدا، کە ژیانی مردوو ژیاوەتەوە
گەنجیم ڕۆیوە و کڵافەی ڕۆژان گل بووەتەوە
لە بۆ داهاتوو، یادی ڕابوردووم وەک سەرکەوتنە
بیکەم بە ئەزموون، بەس گەزۆمژین بۆم ماوەتەوە
س.ش

## بەرتیل

پیرۆزە لە تۆ ڕۆژی لەدایکبوون، وەرزی ژیانەوە
وەرزی مژینی کوڵم و لێوی ئاڵ، بۆ حەسانەوە
هێشتا هەر گەنجی، مادام ژانووست ڕوو لە ئاسۆیە
ئێستاش بەرتیلت بۆ دەدەن شۆخان، بە بانانەوە
ح.ش

## ئاسۆی ڕوون

لەم گەشتەی گەردوون کە ساڵ ئەگەڕێ، هیوا شین ئەبێ
مایەی دڵخۆشی لە هاوڕێ ئەگات، دڵ بەتین ئەبێ
هەرگیز نایەژم من خۆزگەم بە پار، چونکە ئەزانم
هیوا گەشتر و مژینی گەزۆ، مایەی ژین ئەبێ
س.ش



## دەرمان

با ئـەم ڕەچەتـە لـە لات بمێنـێ و شـیفا و دەرمـان بـێ
بـەو هیوایـەی کـە ئاسـمانی دڵـت، گەزۆبـاران بـێ
شـەکرە بـەر شـەپان دەدا بەجـارێ، ماچـی لێـوی تـەڕ
هەموو ساڵێکت خۆشتر لە پار و جاری جاران بێ
ح.ش

## خۆشەویستی

چەندەم بە دڵە لە سەر ڕەوتی خۆ جیهان پڕ بکەین لە خۆشەویستی
دڵ پڕ لە شادی و ئەوین و هیوا، دیدە گەش و ڕوون، ژیان بە مەستی
بانگەواز بکەین بۆ لێوانی تەڕکە هەر وەکوو ڕەز، گەزۆی لێ ئەتکێ
تا پەرە بگری بڕوا لە ژیان، بڕوا هیوایە، هیوا بە هەستی
س.ش

## کۆکە

ئارامم نییە، نە لە ڕووی هەوا، نە لە سەر زەوی
سینگم توند بووە، دەنگم دەرنایەت، وزەم لێ ڕەوی
لە دوێنێ شەوۆ، سەرمام خواردووە، تووشی کۆکە بووم
ئەمجار نۆبەتە، لەم هەل و چەلە، تۆ فریام کەوی
ح.ش



## دەنگی بەی

وریا بە نەکەی ڕەچەتەی یەکەم بە کار بهێنی
کۆکەت چاک ئەبێ، بە ناوکی بەی زۆر بە سەرێنی
هەرچەند ماچی لێو دەرمانی هەموو دەرد و ئاسێوە
لەوە ئەترسم بۆ یاری شۆخت ناسۆر بهێنی!
س.ش



## پارێز

ئەمن ڕەچەتە و فەرموودەی جوانی تۆ ئەسەلمێنم
بەڵام لە وڵاتی شەختە و بەستەڵەک، بەی لە کوێ بێنم!
لە سەر فرمانت من پارێز ئەکەم بەولاوە ناچم
بۆم بدۆزەوە چارەیەکی دی، دەست بە دامێنم
ح.ش



## وڵاتی ماد

ئەوەی تۆ ئەیڵێی کارێکی سەختە، لە لای من و تۆ چاک نابێتەوە
چونکە خۆیایە بە بێ ماچی لێو، ئەو ئەهریمەنە دوور ناخرێتەوە
ئەبێ بڕۆینەوە بۆ وڵاتی ماد، ماسییەکەی دەچڵە فریامان کەوێ
تۆ "تۆبیاس" و منیش " ڕافایل"، لەو دەرد و بەڵا بتپەڕێنمەوە
س.ش

## ئاسمۆدیۆس

بۆچی ئەمبەیتۆ بیست و هەشت سەدە تۆ بەرەو دواوە!
بۆ ولامەکەت تەک جاری پێشوو، وەها گۆڕاوە؟
پەندی تۆ بۆ من پارێز بوو لە ماچ، ئێستا من چ بکەم
تا «ئاسمۆدیۆس»ی هەڵامەتەکەم، بەرم بەولاوە
ح.ش



## چارەسەر

چەند هەزار ساڵە وچەند ئەوەندەی تر، چیرۆکی ئەوین
هەر بەردەوامە و کۆتایی نایە لە سەر ڕووی زەمین
وەکوو پێ ئەچێ، لە ترسی "پارێز" ئاوا تۆقاوی
سێ ڕۆژ ڕاکشێ، پەسیو نامێنێ و ئەبێ بە هەنگوین
س.ش



## دوکتۆری زانا

خـۆت بـاش ئەزانـی چەنـدە ئەسـتەمە پارێـز لـە میـوە
خـۆت دەربـاز بکـەی لـەو هەڵامـەت و کۆکـە و پەسـیوە
فەرمـوودەت بـان سـەر دوکتـۆری زانـا، منیـش ڕام وایە
خاسـت فەرمـاوان، دڵـم لـە ئاسـتی پارێـز تۆقیـوە!
ح.ش

## پەیامی پەنام

گـەر بێـت و بگات "سـرووش" ی "پەنـام" لای "میووز"ەوە
کەوتـەی نـاو جێـگا، ئێـش و ئـازاری ئەڕەوێتـەوە
زۆر شـادمانم ئەوەنـدەی بیسـتم پارێـز نەمـاوە
دەنگـت زەڵال بـوو، ڕەنگت گەشـاوە، زینـدوو بوویتەوە
س.ش

## بلیمەت

شنۆی پەیامی "پەنام" هاتە گوێم، وا حەسامەوە
بە لێکدانەوە و ڕەچەتەی نوێتا، پڕ بووژامەوە
نە کۆکە ماوە و نە هەڵامەت و نە شوێنەواری
دیسان لە ئاستی تۆی بلیمەتا، دۆش دامامەوە
ح.ش



## ئارەزوو

گەورەیی ئەکەی کە دوا پەیامت ئاوا بە دڵە
ژیان ڕازاندنەوەی ئەم فەراگەردە بە ڤیان و گوڵە
وەک نژیارڤانی تەلاری ئەوین ئارەزووی شادی
بۆ تاکە تاکەی دڵ ئەوینداری ئەم ئاو و گڵە
س.ش



## کانیاوی کەپۆ

پارێـزم شـکاند، دیسـان هـەرەس بـوو کانیـاوی کەپـۆم
دیسـان وەک پێرێ شـەربەتی تاڵ و سـووپی جۆ ئەخۆم
سـەرم سـوورماوە، کـە چـی قەومـاوە، بـۆ وا ڕەنجەڕۆم؟
بـۆ وا هەمدیسـان تامـەزرۆی تامـی شـەکراو و گـەزۆم؟!
ح.ش

## بەهای ئەوین

لەبەر هەوەس بوو، ئەڵێن کە "داوود"، "ئوریای" دا بە کوشت
جوانـی "بەس شـابا" تەشـەی بڕیبـوو، بۆیە خوێنی ڕشـت
ئەویـن ئەگـەر هـات، ئـاوەز کامەیـە، خوێـن بەرپـا ئەبـێ
گیـان بـە سـەرگەردی لیمۆ و گۆنـای ئاڵ، گەزۆ بە لێمشـت
س.ش

## هەنگی لێو

دیسان چوویتەوە تۆ بەرەو باخی پاوانی لیمۆ
باسی داوود و ئوریام بۆ دەکەی، چ بکەم من لە تۆ؟!
بڕیارمان وا بوو هەنگی لێو لە سەر گۆنا بنیشێ
تا شیفا بدات شەکرە و پەسیو و هەڵامەت و سۆ
ح.ش

## ژیانی شیاو

دەمێکە ئەڵێن گوایە "پەڕەدیس" لە ئاسمانە
بەڵام سەلماوە لە باخی لیمۆ، لە لای خۆمانە
ئەگەر من هەمبێ مەی و لیمۆ و لێو، شەکرە ئەڵێ چی!
دۆزەخ کامەیە، ژیان دارماڵ نابێ بە بێ ئەمانە
س.ش



## بێ سوود

دیاره بێ سووده پەند و قسەی من بۆ تۆی لیمۆخواز
پێت خۆشە بڕۆی بەرەوخوارتر و خۆت بکەی دەرباز
لە باخی لێو و کوڵم و گەردانە و چەنە و ژێرچەنە
بۆچی لادەدەی؟، شیفا لەوێ یە بۆ شەکرەی ناشاز
ح.ش

## سەری سەرخۆش

من پەرگر نیم و ئەوەی وتوومە هاورێی هۆشمەندم
کەمترین ویست و ئارەزووی دڵە، بۆیە دڵمەندم
سەیزانی شەراب بەشی من ناکا، دڵ هێندە کەیلە
مەستیی شەکرە بێ یان هینی شەراب، من هەر پابەندم
س.ش

## چەمووری

هیچ ڕوێژێکم نییە بۆ ڕادەی ژانی پەنگخواردوو
گەر چەمووریم کرد بەرانبەر بە بەرسڤی ڕابوردوو
ئەتۆ دلشال بە، بمبووره ئەگەر دڵمەندم کردی
هەموو تاوانی پەرسیو و هەپلە و هەڵامەتم بوو
ح.ش



## لێم مەگره

دڵ لە دڵ مەدە، مەبەست تۆ نییە، گەر دل زویرە
خەمە و هاتووە و یەخە بەرنادا، هێندە بێ پیرە
لێم مەگره هاوڕێ کە تۆم ڕەنجاند و تووشی "پانیک" بووم
هەڵمەتە کاسە، ئەو دڵە چەشتەم هێشتاش نێچیرە
س.ش



## ژانیک

بۆچـی گەمیمـان لە سـەر شـەپۆلان هـەر "تایتانیک" بێ
بـۆ سـتێرێکمان دیـاری نادا گـەر، حەوت ئاسـمانیک بێ
دڵ لـە دڵ نـادەم، ناوچاوانێکـە و شـەقڵێکی دزێـو
بۆچی هەمووومان بەشمان هەر دەبێ دەرد و ژانیک بێ؟!

ح.ش



## خەمبەزێن

گەرچـی ودمی «زیـن»، «مەم»ی بێگیـان ئەژێنێتەوە
«تاژدیـن»م ئـەوی، «بەکـۆ» نەهێڵـێ و بمسـینێتەوە
سـۆزی نیشـتمان خوێنـە و زگماگـە، لـە دەمارمایـە
خـەم پێـم ناوەسـتێ، ئـالام «بڕیـار»ە و، ئەشـەکێتەوە

س.ش

## مێوژی چوارتا

هەر وەک شەربەتی مێوژی «چوارتا»ی، «کا عەلی بانە»
دەروون هەژێـن و مێشـک تەزێنە، ئەو چـەن بەیتانە!
باسـی ئەویـن و باسـی وڵات و باسـی کوردانـە
باسـی دڵـداری "زیـن"ی بۆتـان و «مـەم»ی ئالانـە
ح.ش



## هەرمان

ڕەنگـە ئەتـەوێ ئیتـر نەنووسـم بـەم وێنـە جوانـە
جێگـەت لێـژ کـردم، ڕینگاڵـی چوارتـات کـردە بەهانـە
بـەڵام هـەروەک چۆن، مەم هێمای گەل و زین نیشـتمانە
یـەک ئەگرینـەوە، چونکـە یەکگرتـن ئیکسـیری مانـە
س.ش



## هۆبە

شادم بەوەی کە ڕوو لە دەڤەری ئەویینداری کورد
هۆبەت هەڵداوە، و چریکەی چامەت دێ لە زاری کورد
منیش پەیمان بێ وەک "چەکۆ"ی هاوڕێ، چنگم بە هوون بێ
ببم بە گەرووی "لاس" و "سیامەند"، بۆ هاواری کورد
ح.ش

## تۆ بڵێی!

گوێم لە دەنگت بوو، هۆرەت زەلاڵە، چریکەت وەکوو
تەرزە ئەبارێ
گەرچی لە «ژیگ»ی ئەمساڵ نووسراوە، بە تێکڕایی دەنگ
هەر سێک بە جارێ
جەنەراڵ تاونزێند، مەکگورگ، تیلەرسن، بۆ سەربەخۆیی
لەگەڵ کوردانن
بەڵام ڕوون نییە، ئایا خودی کورد، لە دهۆکەوە،
دێ بۆ هەوارێ؟
س.ش

## له‌بزینه

گه‌ر سه‌ربه‌خۆیی ببێ به‌ شه‌كر و باقلاوه‌ و نوقڵ و
گوێز و له‌بزینه
كۆبوونه‌وه‌كه‌ی دهۆک پێی ناخورێ، ده‌ڵێ ئه‌مه‌ چه‌س؟
فره‌ سه‌نگینه‌!
كوا به‌شی برای ئێرانی و عه‌ره‌ب؟ ئه‌ی توركی فه‌قیر!
سه‌ربه‌خۆیی چی؟!
شانمان نزم ئه‌بێ، زیز ئه‌بن لێمان، ئه‌مه‌ تاوانه‌، لایبه‌،
تێی ڕینه‌...
ح.ش

## به‌رداشی شۆڕش

په‌رژینـی گـوڵ بێ، گوڵاو له‌ ڕووتا، فرسـه‌ندیش باشـه‌
ئاشـكرا و ڕوونـه‌، بڕیـاری مێـژوو، نـه‌ زۆر به‌لاشـه‌
بـه‌ پێچه‌وانـه‌ی لـۆر و به‌رژه‌وه‌نـد كـۆ بوونه‌تـه‌وه‌
ئه‌وه‌ی هه‌و نه‌بێ، ورد ورد ئه‌یهاڕێ، گه‌ل خۆی به‌رداشه‌
س.ش



## پاچاڵ

سالانێ زۆرە، لە کار کەوتووە، گەل، ئەو بەرداشە
سیستەم بەڕۆژە و، نەما ئەو هەوا کە گەل پێی باشە
خاوەن چاڵەکان خۆیان حیسابن، تاک پەڕاوێزە
"پاچاڵەکانیش"، پێیان نابزوێ ئەو بەردە تاشە
ح.ش



## بێچمی نوێ

ڕۆژ لە گەڕدایە، سەد ساڵ وەگەڕا، ناچار ئەدۆڕن
"لۆزان"ی نوێیە، بڕیاریان داوە، سنوور ئەگۆڕن
بازاڕی ناوخۆ کاتێ کە پێکهات، سەربەخۆییە
گەر بێت و نەیخۆن، لە قاپیی مێژوو، سووک و سەرشۆڕن
س.ش

## بازاڕی ناوخۆ

بازاڕی ناوخۆ ئەگەر پاوان بێ، زۆر لەناو خۆیە!
واتای ئەوەیە، گەل بەشخوراوە و هەر ڕەنجەڕۆیە
ئەو بازاڕەی کە بە تەنیا "سەوز" و "زەرد"ی تێدا بێ
بە بێ ڕەنگەکان! کوا وە بازاڕە؟ هەمووی دهۆیە
ح.ش



## تەلاری داد

ئەوەی کە ناوی شارستانییەتە، بە خوێن و خەبات بەدی هاتووە
ئەوەی تەلارە، لێزکی سوێری ڕۆڵەی هەژارە هەڵی بەستووە
ئەگەر هەمانبێ ئاڵای سەربەخۆ، چەقی خەباتمان بۆ ڕەواییە
بۆ چەسپاندنی ئەو مافانەیە، خوێنی پێشمەرگە، ڕەنگی ڕشتووە
س.ش



## کوردی چاڵدار

لە ماکی مەبەست تێگەیشتم من، بەڵام خوێن تاکەی
بڕژێ لەم خاکە!
دڵنیام لەوەی کە لێمشتی گەل، دێ و ڕادەماڵی
ئەوەی ناپاکە
خەباتی دوێنێ ڕوو لە دوژمن بوو، بۆ سەربەخۆیی و
بۆ سەرفرازی
بەڵام بەیانی، «کوردی چاڵدار»ە، تەفر و توون ئەکا
چی کۆڕ و تاکە
ح.ش

## ڕاستەقینە

چەند هەستۆک بین و چەندە بپرسین: ئاخۆ خوێن تاکەی؟
ڕۆژەڤ تا نەبێ بە ڕاستەقینە، بە هیچ ماف ناگەی
ئاگــــر کە تیـــن و وزەی ژیانە، ئەشـــمان ســـووتێنێ
فەرهەنگ ئەیهەوێ، تا پێکی بێنی و، ماف تا پێی بگەی
س.ش

## ڕاژێر

ڕۆژەڤ تا ڕاستەقینە، تەمە و دەبێ بڕەوێ
کاژەنگی ئەو دوو چەمکە، لە بیری ورد ئەکەوێ
هزری مرۆڤ گەر چێ بێ، دینامۆی ڕزگار بوونە
ڕاژێر ئەزموونی کۆنە، ڤەژینی تازەی ئەوێ
ح.ش

## تەشکی نوێ

من ئەڵێم هەنگوور، تۆ ئێژی ترێ، ئەوە تەم نییە جۆگەلەی خوێنە
هزری مرۆڤیش بە ئەگەر نابێ، پەروەردە نەبێ، بێ ڕێگە و شوێنە
کوانێ کامەیە ئەو بیرە نوێیە؟ ئەو ڕێگە تازە، بۆ کوێ ئەچین؟
لە سەر ڕاژێری بیرسا ڕای بخە، گەڵاڵە و تەشکی جوانی بنوێنە
س.ش



## پەروەردە

مرۆڤ کە هزری پەروەردە نەبوو، ئەبێ بە پێچکەی دەسەڵات و زۆر
هەر ئەوەش واتای ئەگەر دەنوێنێ، بە ئەگەر دەبێ ئەو تاپۆیە مۆر
ڕاژێر کراژە و دەبێ بیگۆڕین، بەڵام نەک بە خوێن، بەڵکوو بە خوێندن
ڕێگای پەروەردە و زانستە تەنیا، دنیا بۆ گەلان ڕوون ئەکا وەک خۆڕ
ح.ش

## بەرنامە

منیش لەگەڵدام کاتێ بە گشتی باسی شت ئەکەین نە زۆر دژوارە
ئێژین بە خوێندن، با بە خوێن نەبێ، بەڵام ئەمە خۆی جێی پرســـیارە
واتە گەڵاڵە بەرنامەیەکە و ڕێ پیشـــاندەرە و، پێناســـە ئەکات
پرسم ئەوە بوو: بۆ کوێ ئەچین؟ بە کامە شێواز ڕێگەی هەموارە؟
س.ش

## واوێژ

واوێژی پرست جێگای نابێتۆ، لە نێو چوارچێوەی
تەسکی چوارێنە
سەرکردەی لۆژ و سەرچاوەی کۆراڤ، لڤین نەرم و
ورد، سەبر و بە شێنە
هیوا پەڕاویز، ڕووناکبیر گەڤەر، ئەندێشە و بڕوا کەفتە
و دلۆرە
ڕێگا ناهەموار، شێواز نادیار، نازانم هەوار ڕووی
بەرەو کوێنە!

ح.ش

## ماڵاوایی

وەک پێشتر وتم: لێی ژێوان نابم، کازیوەی داوە و
ئاسۆم لا ڕوونە
گەیشتە ئەوەی بەس ڕەخنە بگرم، دەنووکم کولە و
بۆ لاڕێ چوونە
لە پێناو ئامانج ئەم دەنووکێنە، جێ ئەهێڵم و
ئەڵێم ماڵیاوا
چونکە چەن ڕۆژە بیر ئەکەمەوە، درێژەی بدەم وەک
سوێنک سوونە

س.ش

کۆتایی دەنووکێنی نێوان
کاک سیامەند شاسواری و حەسەن شافێعی.

---

# دڵم ون کردووە

پێم دەڵێن کوا خۆشەویستت؟ واری بۆ کوێ بردووە؟
وا لە تۆی دڵما بەڵام چ بکەم؟! دڵم ون کردووە

خەزەڵوەری ٢٧١٨، ئۆتاوا

کوردێندراوی دوانەیەکی «هیلالی جۆغەتایی»

ای که میپرسی ز من آن ما ه را منزل کجاست؟
منزل او در دل است، اما ندانم دل کجاست!

هلالی جغتایی

# ده بڕۆ، ون به ئیتر...

ده بڕۆ، ون به ئیتر، نازانی؟!...
تۆ نەکوردی، نه سەرۆک کوردانی
زامی شنگال و شیفای تورکانی
پێچکەیەکی قەنەفەی سوڵتانی
تانەیەکی که له نێو چاوانی

سەری ڕەش خۆش بێ چ مایەی کەسەره؟
سەری دیکه، هەموو هەر دەردیسەره
ئەمری سوڵتانه که تەنیا تەوەره
هەوڵی کوردایەتی، مایەی زەرەره
تاکوو (چانکایا)، دوچاری خەتەره

بۆ «گزیرانه»، له سەر فەرمانی
پەنجەشێری لەشی کوردستانی
کاولت کرد هەموو کێڵگه و کانی



خوێنی کوردت لە زەوی دەرهانی

پێشکەشت کرد بە سەگی عوسمانی

چاخی ئازادیە، هەڵدەینەوە چاک

تا بە لێمشتی وزەی کۆمەڵ و تاک

ڕا بدەین کاپەکی بیری ناپاک

لا بدەین تاپۆ لە سەر ڕواڵەتی فاک

با ببووژێنەوە هەرد و کەش و خاک

ڕۆژی یەکگرتن و سەرهەڵدانە

نیشتمان، چاوی لە هیممەتمانە

تا کوو ئەم خاکە، کە کوردستانە

بە شنەی بیری گەش و کوردانە

لەشی پاکژ بێ لە غەور و تانە

٤ی بانەمەڕی ۲۷۱۷ ی کوردی. ئۆتاوا - کانادا

بە بۆنەی هێرشی تورک بۆ سەر زامە خۆش نەبووەکانی شنگال و دیرک و نەبوونی هەڵوێستی کوردانە و نەتەوەیی لە لایەن کوێخا خۆماڵییەکانی باشوور.

# دێمە کاڵان

له بیرت دێ نزیکی دێمه کاڵان
له سووچی مەنزڵ و مزگەوت و ماڵان
ڕوانینمان هەموو تێکڵاوی یەک کرد
دزی چاوت دڵی بردم به تاڵان
له بیرت دێ هەناسەم هات به ڕووتا
دەمم نا سەر ڕەشایی وردە خاڵان
له بیرت دێ به سەرخۆشی دەکەوتم
به بۆنی عەتری بسکی چاو کەژاڵان
له بیرم دێ منیش ئەوسا قەدی خۆم
وەکوو لاولاو له باڵای تۆ دەئاڵاند
گەلێ جێژوانی خۆشم کرد لەگەڵتا
له پشت پەنجێرە یا تاریکه داڵان
هەموو ڕۆشت و له لامان بوو به خەونێ
به دڵ ئەیڵێم: هەزار خۆزگەم به ساڵان



حامید شافێعی - سەقز

# دیدە کاڵان

لە لای مزگەوت و حەوزی دێمەکاڵان

محاڵە تێپەڕی وەک بێ خەیاڵان

لە بەر شاڵاوی چاوانی شەڕاشۆ

ئەچێ ڕۆح و دڵ و دیدەت بە تاڵان

جەنابی کاکە حامید من دەزانم

چییان پێ کردی تێیدا چاو کەژاڵان

نەگۆڕە دلڕفێنی لەو هەوێڵە

بە ڕەسم و دابەکەی جاران و ساڵان

دەکا ناودێری ئەو کۆڵانە «فاتێح»

لە باتی دێمە کاڵان ، «دیدە کاڵان»

فاتێح موحەممەدی . ف-نامۆ . تاران

# «دێمه حاڵان»

جەنابان، شاعیران، ناسک خەیاڵان

وەرن با لێگەڕێین، باسی بەتاڵان

بە سەردانێک پەژیوان دەبنەوە زوو

ئەگەر ئێستا بڕۆن، بۆ دێمەکاڵان

نە، ماوە شوێنەواری چاوکەژاڵان

نە دڵ دەڕفێ، نە ئەقڵ ئەروا بە تاڵان

نە کانی ما، نە لەنجە و ئاوی سەر شان

نە ژوانی پڕ مەترسی دیدە کاڵان

کەپۆ، «بانداژ» و لێو و دەم، «پڕۆتێز»

ئیتر نابزوێ هەست بۆ وردەخاڵان

هەموو شێوازی ئاڕایشت «خەلیجی»

نەما جوانی سرووشتیی کۆنە ساڵان



دە «فاتێح» لێگەڕێ با نەڕوا «حامید»

ئەگینا وشک ئەبێ کانی خەیاڵان

منیش کۆڵانی کۆنی ئەشقی ئێوە

دەکەم ناودێر، بە کووچەی «دێمە حاڵان»

١٥ی خەرمانانی ٢٧١٧ - ئۆتاوا، کانادا

## دێمەکاڵان ٢

چ جوانە بەرهەمی شیعری هەڤاڵان

وزەی پێنووسەکەی ناسک خەیاڵان

لە نامۆ و کاکە حامید و حەسەن گیان

کە تا باسی بکەی بەرز و بە باڵان

دڵی هەر بیسەرێ بەو چەپکە شیعرە

دەلەرزێ و دەس بە جێ دەڕوا بە تاڵان

چ غەوغایەکی خستۆتە دڵی شار

کچی گۆزە لە شانی «دێمەکاڵان»!!

لە پێناوی ئەواندا خێڵی ئاشق

ئەسیری خەت و خاڵ و بسکی واڵان

لە ئەو تەنگەبەرە کۆڵانە دیسان

کوڕان هەروا لە ناڵە و قرم و قاڵان

شەقامی» ساحیلی» و پارکی گوڵی شار

گەشن بەو حەوز و مزگەوتەی لە پاڵان

قژی کاڵی کچی گۆزە لە سەر شان

لە مەڵبەندی ئەویندا چەشنی ئاڵان

نزای کوڕگەل لە بەر کۆڵانی مزگەوت

ئەڵێی «نانی فەقێ» یە و دەرکی ماڵان

خودایا «دێمەکاڵان» تا دوا ڕۆژ

بمێنێ چەشنی هێما بۆ هەڤاڵان

ئێحسان ئەخەوان . تاران



لەهەجوی هەڤاڵێکدا

# دەردەمەحموو

مەحموو بیستوومە ئەندامت دەخورێ

کەس نییە لەرزی گیانت بۆ ببڕێ

شەو لە ناو جێگا هەر خۆت ئەخورێنی

لە حەیبەتی لیرگ، کەوا ئەدڕێنی

ساتێ پەنا مل، ساتێ ژێر ئەژنۆ

ساتێ بن باڵ و، ساتێ ژێر کەپۆ

ساتێ ئەخورێنی سەر تەوقی سەرت

ساتێ نامێنێ، لیباس، لەبەرت

جل و بەرگی خۆت هەموو تووڕ ئەدەی

بەملا و بەولادا هەر خۆت سووڕ ئەدی

کاکی حەرارەت، وەهام لێ دیارە

بە دەست کرمەوە کاری تۆ، زارە

وادیارە خەریک خۆ پیشاندانن

قەی ناکا کرمن دەردت نازانن

جا ئیتر لە بات دەرد و بێزاری

هەستە ڕێ کەوە بەرەو بێهداری

فەرموو حەکیمی سک پڕ لەکرمان

کەرم کە دەردم، بۆ بکە دەرمان

فێرگەی سەرەتایی ئاوایی میرەدێ،

سەقز، پاییزی ١٣٥٨



# دەریایی

لە بەحری بێ سنووری غەم
پەشێو و مات و شەیدایی
تەمەن دەڕوا بەرەو ژوور و
ژیان دەڕوا بە خۆڕایی

لە باغی بێبەری عومرا
دەناڵێنێ مەلی ژینم
نەماوە هاوەڵێ ئەورۆ
نەجاتم با لە تەنیایی

«لە داخی عومری بابردوو»
«بە یادی ژینی ڕابوردوو»
دەکێشم ڕەنجی بێهوودە
بە وێنەی دیلی دەریایی

زەمانێ مەست و مەدهۆشم
زەمانێ شێت و بێ پەروا

بە بێتاوان حەیای سەندم

دڵی بێشەرمی هەرجایی

پەپوولەی باغی دڵداریيم

مەلی سەرخۆشی پاساریيم

ئەنیسی شیوەن و زاريیم

دەکەم هاواری شەیدایی

شەکەر دەڕژێ لە هەڵبەستم

بە بۆنەی لێوی شیرینی

کە مەدحی لێوی دڵدارە

منی خستۆتە ڕسوایی

دڵ و دیدەم لە پێناوی

زەمانێکە کە دڵدارم

لە سەر لوتفۆ هەڵیبێنێ

دوو چاوی شینی دەریایی

حەسەن شافێعی . سەقز - ساڵی ١٣٥٤



# دەستی تۆ خۆش...

دەستی تۆ خۆش بە وشەی کەسک و گەشت دەمبەیە
گەشت

تا لە نێو شیعری ئەتۆ بێمە نەشەی دینی بەهەشت

فاتێح موحەمەدی . نامۆ

وەڵامی من بۆ

## دەستی تۆ خۆش...

هەر کە دایدا بە سەرمدا گوڵی شیعرت وەکوو وەشت

نەمتوانی کە وەڵامت نەدەم و بیخەمە مەشت

گەلێ دڵخۆشە وشەم چون بووە هۆکاری ئەوەی

دڵی تەنگت بڕەوێنێ لە هەوای واری بەهەشت

ئۆتاوا - گوڵانی ٢٧٢٠

# دڵدانەوە

نوور ئاما دییەم جە دیداریٚ چەم

ڕەوی ژ چەمان غوباریٚ ماتەم

برای هاوفەرد و هاودەرد و هاودەم

مەپۆش وە باڵای دڵ دوومانیٚ خەم

وە دیمە و ڕوخسار، هەنوو زەنگینی

هەنوو شاداو و تەڕ و ڕەنگینی

دڵ وەش کەر هەرچەن جە پشت دووروینی

مادام کە هێشتا «جوانی»، ئەبینی

ئۆتاوا، ١٨ی بەفرانباری ٢٧١٧

دڵدانەوەی کاک عەباس یارانی

سازیٚ تەپڵیٚ گۆش نم کێشان کەم کەم
ئەیسەرەوسەرەن دوورویەنەکەی چەم

مەولەوی



# دڵ

هێند بە شەوقی دیدەنی تو چاو لە ڕێگا مایە دڵ

دڵ دەزانێ و من دەزانم چەن لە تاسەتدایە دڵ

ئەو دەمەش وا دڵ بە گڵ بێ ، خۆشەویستیت لەو گڵە

سەر دەرێنێ و گوڵ دەهێنێ و تا ئەبەد جێگایە دڵ

ئۆتاوا ، گولانی ٢٧٢٠

وەرگێڕاوی شیعری مەولانای ڕوومی



اشتیاقی کە بە دیدار تو دارد دل من

دل من داند و من دانم و دل داند و من

خاک من گل شود و گل شکفد از گل من

تا ابد مهر تو بیرون نرود از دل من

# دمــــدم

دمدم شوورەی ئازایەتی
دمدم قەڵای کوردایەتی
واری باز و هەڵۆی چەلەنگ
لە سەر تەویڵ و چاوی کورد
ئۆل و ئایە و،
هێما و بەرژەنگ

دمدم هەناسەی گەرمی ژین
مەکۆی سەرهەڵدان و ڤەژین
بۆ سەدان و بۆ هەزاران،
چەکۆ و عرفۆ و،
قەرە تاژدین

سمکۆ و نحۆی دلۆڤانی
ڕێبازی خانی لەپ زێڕین



**گیانی ئازای ئەحمەد خانی**

**تۆ...**

**ژیانی**

**تۆ ڕاسانی ، تۆ هەرمانی**

**تۆ داستانی یێکۆتایی**

**کوردایەتی و**

**بەرخۆدانی**

**ئۆتاوا ، بەفرانباری ٢٧٢٠**



# دوایین ماچ

هەر چەندە لە سووچی ڕکەدا بێبالّم

پڕ خۆزگە لە بۆ ماچێ لە لێوی ئالّم

دەم هەڵنەگرم لە ماچی شیرین تاکوو

شیرین بڕەوێ، دوا دەمی ژینی تالّم

ئۆتاوا، یەکی سەرماوەزی ٢٧١٨

هر چند شکسته پر به کنج قفسم

یک بوسه بود از لب لعلت هوسم

وان بوسه چنان است که لب بر لب تو

آنقدر بماند که نماند نفسم

فریدون مشیری





# دۆعـــــا

ئەو کەسەی مەستی نیگاتە یارەبی دێوانە بێ

ئەو دڵەی شادە بە وەسڵت یارەبی وێرانە بێ

ئەو دەسەی ئاڵا لە دەوری گەردنی بێگەردی تۆ

یارەبی بشکێ و مورادی خاوەنی گیرا نەبێ

سـەقز ١٣٥٤

# «دڵم ماتە»

بە بێ تۆیی، دەم و ژەم مەرگەساتە

خەمی کۆچت، بە باڵای دڵ خەڵاتە

هەناوم وشکەڕۆیە و لەش گڵئاژۆ

بە مەرگی تۆ قەسەم، دڵ ماتی ماتە



بۆ کۆچی دوایی دایکی خاتوو فەریدە

٢١ی دیسامبری ٢٠١٧، ئۆتاوا

# دۆشاو



ڕۆژی دووشەممە هاتم بۆ دوکان
کلیلم لە ناو قوفڵا، هەڵچەرخان

سەیرم کرد دەرگا بازە و ئاواڵە
کەسێکی لێیە بە ئیش سەرقاڵە

ئەمن پێموابوو کە مامۆستایە
بەڵام زوو زانیم زەینم خەتایە

گەنجێ بوو قۆز و تەمەن بیستساڵە
بەژنی هەر دەتگوت دار پرتەقاڵە

سمێڵی باریک وەکوو کلکی مار
لە دوو لای کەپۆ هاتبوونە خوار

قژی بە وێنەی ڕێحانەی ڕەش بوو
سیمای هەر وەکوو بڵاڵووک گەش بوو

سەر و تەرحی وەک مینیاتۆری چین
دەیڕفاند لە گشت کچێ دڵ و دین

ناوقەدی باریک باڵای وەک دارمەوز
زەرد و کەسک و بۆر وەک سۆنەی ناو حەوز



تەمەنی بەینی بیست و بیست و دوو
دینیان دەگۆڕی لە بۆی، گەور و جوو

بەکورتی ئەمن سەرم دەخولاوە
کە چۆن هاتوەتە دوکان ئەو لاوە

پێش ئەوەی زیاتر سەر بشێوێ لێم
بە بزە فەرمووی: نازانی من کێم؟

عەرزم کرد وەڵڵا شێوەت ئاشناس
تەرحت لە قەوم و قیلەی مامۆساس

فەرمووی: هەی دۆشاو باش منت ناسی
وێدەچێ ئەمڕۆ زۆر وڕ و کاسی

وەرە پێشەوە ئا بەم چاویلکە
باش سەیرم بکەم جارێکی دیکە

چاویلکەم لێدا و چوومە نزیکی
سەیرم کرد بەژن و باڵای فەریکی

وتم بەو شێوە تۆ هاتووی ڕاسای
لە بن عەرزیش بێ خزمی مامۆسای

بەڵام زۆر گەنجی، نازانم کامی
خوشکەزای؟ برای؟ یان کوڕەمامی؟



فەرمووی: وا دیارە هزرت سواوە
سۆما و بینایی چاوت نەماوە

جارێکی تریش دۆشاو بەهێنت
بە کڵاوی بۆر و بەکراسی شینت

چۆن لە پاش دوو ساڵ ئەمن ناناسی
پێویستە بخۆی هەر ڕۆنی ماسی





تا دیسان زەینت ببێتەوە نوێ
مامۆستا و خزمی لەیەک بکەی جوێ

خۆمم، مامۆستام، نە خزم و قیلەی
هەر کەس نامناسێ، گوو بەتەقیلەی

سمێڵی پانم کردووە باریک
تاکوو بنوێنم گەنج و تازە و شیک

لە قژم داوە پالێت و بۆیاخ
تا ببم قۆز و لەبار و پەرداخ

ڕیشم تاشیوە بە تیغی شەشپەڕ
لێم داوە عەتر و ئەفتەرشەیڤی تەڕ

پۆشیومە بەرگی کەسک و زەرد و بۆر
تا بێنە داوم کچگەل جۆراوجۆر

بەڵام بڕوات بێ بە جوانی و خاسی
هەر کە هاتیە ژوور تۆ منت ناسی

کەچی وەک تووڵبڕ خۆت لێم کردە گێل
بەهانەت هێنا بۆ زۆڵف و سمێڵ

گوایە من گەنجم تۆ من ناناسی
بەڵام فەرموودەت دوورە لە ڕاسی

چونکەهەستم کرد خۆت «ئاوت ئاف دەیتی»
وا پەکت کەوتووە هەر دەڵێی مەیتی

بۆیە بەو فێڵە ویستت بزانی
ڕەمزی قۆز بوون و ڕازی جەوانی

ئۆتاوا- مەی ٢٥/ ٢٠٠٨

# دووکەڵ و کۆتە

تەمەن کە تێکەڵ بە دڵداری بێ

دڵ تەڕ دەمێنێ و تەرز ئەبێتەوە

گوێ نادا بەوەی ڕواڵەت پووکابێ

دووکەڵ لە کۆتە بەرز ئەبێتەوە

ئۆتاوا ، ڕەزبەری ٢٧٢٠ .



# دوایین گەڵای ساڵ

دوایین گەڵاکانی دیوانی ئەم ساڵە
تەرخان بکە
بۆ ئەوانەی کە «هەرمانن»
ئەوانەی قەت لە بیر ناچن
هەموو دەم
لە پێش چاوانن
ئەوانەی کە،
هاوڕێی شیرینی و،
تاڵیت بوون
هەموو دەم و چرکە و ساتێ
شادیی و بزە و،
سەرقاڵیت بوون

ئەوانەی کە ڕێی ژیانیان
بەرەو ساباتی خۆشەویستی و هاوڕێ بوون
یەکلایەن بوو
دڵت لە هاوڕێ بوونی وان



لەم ڕێگادا،

ئەرخایەن بوو

دەبێ کۆتا پەڕەی ساڵت

نووشتەیەک بێت

دایم لەبەر چاوانتدا

خۆ بنوێنێ

بۆوەی هەموو لەند و کەند و،

کەوت و ژانت،

وە بیر بێنێ

کێ دوورپەرێز

بە کەوتنی تۆ خەنی بوو!

یان ئاخۆ کێ

بە تان و پۆی سۆز و پەیمان

خانووی دڵی تۆی تەنیبوو

وەها کە توانیت ڕاوەستی و

نوێ بیتەوە

لە کەساسی و،

نائومێدی و ڕەنجی ژیان

جوێ بیتەوە

دوایین لاپەڕەی ساڵی کۆن

بە نووشتە،

ڕەش داگیرسێنە

پێنووس بە سەر

پەڕەی دەشتی کۆتایی ئەم ساڵا

بێنە

بنووسە واتای ساڵی نوێ

دڵێ،

بە قووڵی زەریایە

تەکاندن و فڕێدانی

چی ڕق و قین و ڕیایە

ساڵی بەشانەوەی خەندە و

خۆشەویستی و

بەرامەی ئەوین و ئاشتی

لە سەرتاسەری دونیایە

پێشکەشی کە بەوەی سەودای

خۆشترین و باشترینی

بۆ دڵی تۆ،

لە سەردایە

ئۆتاوا، نەورۆزی ٢٧١٩



# نامۆ و زەبەردەست

که دێی دادێنی کاکه پرچی هەڵبەست

کەسێ نامێنێ لەو کارەت نەبێ مەست

له کارت کاک حەسەن سەرسامه فاتێح

زەبەردەستی ، زەبەردەستی ، زەبەردەست

ف . نامۆ

له داهێنانی شیعری زۆر بەتامۆ

هەتا هەڵبەست و ئاواز و مەقامۆ

هەموو لوتفی سواکەی شارەکەم بوو

که نامۆ بوو ، که نامۆ بوو ، که نامۆ

ح . ش



# ئەمەگ

کە مردم نامەوێ گریان و ڕۆڕۆ

مەخابن دەربڕین و جەرگی پڕ سۆ

دەبا هەرگیز نەیەتە سەر مەزارم

ئەوەی هاوکۆکی نامۆیانە ئەمڕۆ

کەسێ شادی بکا جارێ خەڵاتم

بە سەرگەردی ئەبم تا ڕۆژی گڵکۆ

بە ئاواتم دەمی پڕ بێ لە ئۆخەی

لە باتی ئاهی سەرد و ئای و ئاخۆ

لە لای من ئەو کەسەی جێی ڕێزە، جارێ

پەڕۆیەک بۆ برینێ کا بە بۆسۆ

قسەی «فاتیح» و باسی خەڵکی ناشاز

تەبایە و ناتەبا، هەیهات و هەیهۆ

فاتێح موحەمەدی . نامۆ





# تاپۆ

(وەڵامی ئەمەگ)

مەرگ ناوێرێ هەرگیز پێت ، چییە هۆ ؟ !
کە ڕووی شیعرت لە جێی ئامانج و ئاسۆ
هەواری بردووە بۆ کرک و چۆڵان
ج قەوماوە ؟ چ باسە ؟ کاکە «نامۆ»
لە لای ئەهلی هونەر ، مردن ژیانە
ژیان ئاوێتەیە دایم لەگەڵ تۆ
هونەر قەت نامرێ ، زیندوو دەمێنێ
هونەر دەست و کەمانە و شان و باهۆ
کە وا بوو چۆن دەبێ ئەی شاعیری تەڕ
بکەی باسی نەمان و مەرگ و گڵکۆ
لە بۆ کورد و زمان و شیعر و دابی
ئەتۆ خۆت بووی بە موڵک و ماڵ و تاپۆ

ئۆتاوا ، گوڵانی ٢٧٢٠

... " زۆر مەمنوون کاکە گیان. نموونەم نییە لە ناو ئەم دونیایە.

راحت جان طلبم، منت جانان نخرم..

مۆحتەشەم تاتایی. ٢٨ی ئاگوستی ٢٠١٩، گاتینۆ

وەڵام بۆ کاک موحتەشەم تاتایی

## انقلاب

راحت جانی و بی منت جانان بودی
اینچنین بود که در ژرف غنا آسودی

خوش بود گر همگی جمله احباب غریب
ببرند از نفس گرم و ذکای تو نصیب

چونکه مفتوح نمودی به کرامت ابواب
لاجرم کل حبیبان برهیدند ز خواب

انقلاب است چنین کار، نه امریست بسیط!
چشم ما را بگشودی به مساحت، به محیط

کن تفقد تو نگهدار اطاقی ز کرم
زان عمارت، جهت واشدگان ز حرم

ئۆتاوا - ٢٨ی ئاگوستی ٢٠١٩



# ئەسری پێشمەرگە



حیزب و پارتی «پێترۆدۆلار»،
کوا دەربەستی،
ئەسری چاوی پێشمەرگەیە؟
کوردی چاڵدار،...
کەی خەمخۆری،
شەهید و ئاڵا و وڵات و
لە کوێ،...
پیاوی شەڕگەیە؟!
لە قامووسی ئەم کوێخا و وردە شێخانە:
ئەوەی بۆ وان کوردستانە،
ئەوەی لای ئەوان،
سنوور و نیشتمانە
یەک دوو شارۆچکە و هۆتێل و
چەن کازینۆ و
دوو گەڕەکی، «سەری ڕەش» و،
«دەباشانە»...



ئۆتاوا، خەزەڵوەری ٢٧١٧



# ئەوا لێرە

ئەوا لێرە
لە ئاسانە و ڕووگەی هەزارهیوای مرۆڤ
ژیان شانۆی مەرگەساتە
ئەوا لێرە
لە باژێڕی پارە و گیرفان
درۆ یاسا،
ئەوین دراو
دڵ و خۆشەویستی، قاتە

ئەوا لێرە
لەم وڵاتە بێ بەهارە
ئاسمان و مانگ و ئەستێرە
ڕەنگ بزرکاو،
مەل غەوارە
ئەم وڵاتە،
ڕێبەندانی خاکەلێوە و گەلاوێژی بەفرانبارە
نە قاسپەی کەو
نە بژوێن و چیا و کانی
نە سەمای بەژنی شۆڕەبی
لە ئاوێنەی چەما دیارە

ئەوا لێرە
لە بەژی بە بەژن بڕاوی سەرمایە
مرۆڤایەتی بێبایی
ژین سەودایە
لێرە هێشتا
سوڵتان سێبەری خودایە
هێشتا دەوری
کڕنۆش و شا و بارەگایە
بە بارتەقای دار و بەردی ئەم دنیایە
جیاوازی،
وا لەنێوان مرۆڤایە

ئەوا لێرە
لەم زیندانە
لەم دۆزەخی هەندەرانە
لەم وڵاتە بێ ئاسمانە
گۆنای گوڵە کۆچەرەکان زەردەپەڕە و



هێشتا مرۆڤ،
هەر دەسازۆی ژەمێک نانە

ئەوا لێرە
لەم وڵاتە پڕ داوەڵە
نە زەردەی لێو
نە پێکەنین
هەموو تەوێڵێک دۆژەنگە
لێرە مرۆڤ
دەسەمۆی خوای ڕێسای نوێیە
نەگۆڕان و، نەسەرهەڵدان،
گەرووی ڕاپەڕین
بێدەنگە

ئەوا لێرە
لە مەڵبەندی خوێناو و ئارەقە و دڵۆ
ئەوەی ورگی زەلامتر بێ
بەپێزترە
لەم خاکە سەرلێشێواوە
گیرفان لە دڵ،
نەزان لە هۆزان و زانا،
سەگ لە ئینسان،
بەڕێزترە

ئۆتاوا - کانادا هاوینی ١٩٩٨



# ئەی سەقز

ئەی سەقز چەن خۆشە سەیری دیمەنی دەشت و چیات
خێوەتی بەزمی دڵانە باغ و گوڵزار و گیات
بێ شکە سەرتۆپی کۆڕن لاوی بێ ڕەنگ و ڕیات
حەق کە دڵ وێران ئەکەن سیمین ڕوخانی موو سیات
قیبلەگای خاوەن دڵانە سەر تەپی ماڵانی تۆ

پێم بەهەشتە پارکی شار و ساحیلی و بلوارەکەت
فەرشی ڕازاوەی گوڵانە دیمەنی کۆسارەکەت
لام وەکوو ئاسکی نزارە کیژی گوڵ ڕوخسارەکەت
سەد بەهاری شەرمەزارە چیمەن و گوڵزارەکەت
ئەشکی دیدەی ئاشقانە دەنکەکەی بارانی تۆ



ئـەی سـەقز موڵكی فەرەنگی خاكی بـێ قەدرە لە لات
شـۆڕە باغـی بابیلـی ، بـێ نرخـە لای دار و گـەڵات
شـەرمەزاری شـەوقی تۆیە خـۆری بێ وێنـەی وڵات
هـەر لـە كانـی ئاشـقان تـا پردی سـەر چـۆم و قەڵات
بەرگی نەرمـــی پەڕنیانـــە خاكەكـــەی كۆڵانی تۆ

خاكـی زێـڕت مەرهەمـی جەرگـی برینـداری منـە
نـاوی خۆشـت شـەمعی ڕووناكـی شـەوی تـاری منە
ئـەی سـەقز خـاوەن دڵێكـم مەدحـی تـۆ كاری منـە
شـاهیدم هەڵبەسـت و شـیعر و ویـردی شـەوگاری منە
پێم شـــنەی خۆشـــی بەیانە ســـۆزەكەی زریانی تۆ

پاییزی ١٣٥١ - بیجاڕ - كوردستان



# گلەیی لە پیری

نە سۆمای چاو و قەدیش خەمیدە
هەڵواهەڵوامە و ئەویش دەس نمیدە

عوسمان تۆپچی



# چاویلکه

هەڵوا هەڵوا هەر زاخاوی چاوە
داو کۆن و نێچیر تەرە و تۆراوە
گەر دەستیش بدات، کوا تیر و خەشاب !
هەر وەک تیر دەرچوو قۆناغی شەباب
ئەو کات کە ئێمە تیغمان دەبان بوو
ئەم بابەتگەلە، هەموو پاوان بوو
ئێستا کە وەکوو خەرمان ڕژاوە
چەک ژەنگی هێنا و تیغیش سواوە
وەتەی من و تۆ پێمان نا دنیا
بەرگی بەختی مە، بە خۆزگە چنیا
ئێستاس ئێمەین و دنیا و ئاڵ و گۆڕ
خۆمان شپرزە و چەکیشمان سەرشۆڕ
بۆمان ماوەتۆ تەنیا دوو دیدە
ئەویش چاویلکە، تەواو تێی ڕیدە

جۆزەردانی ٢٧٢٠
گلەیی عوسمان و وەڵامی من

## خەم

گەر خەم وەک ئاگر دووکەڵی بایە
جیهان تاریک بوو هەتا هەتایە
ئەم دونیا هەموو سەنگ و سووژن کەی
نابینی دڵخۆش ئەوەی زانایە

ئۆتاوا، ٢٠٠٥

## غم

اگر غم را چو آتش دود بودی
جهان تاریک بودی جاودانه
در این دنیا سراسر گر بگردی
خردمندی نیابی شادمانه

شهید بلخی





# گرده‌سوور

گرده‌سوور
ئه‌ی نوقمینه‌ی سینگی پیرۆزت
ته‌رمی هاوڕێی زه‌حمه‌تکێشان
گرده‌سوور
نوێنگه‌ی بڕوای سوور
ئه‌ی هانده‌ری شۆڕشگێڕان
ئه‌ی شارێنه‌ری هۆنه‌ری
هۆنراوه‌ی به‌رزی تووتنه‌وان
سوێند به‌ ئاقێقی سه‌ر سینگت
به‌ ئاواره‌
به‌ڵێن ئه‌ده‌م
به‌ دڵ، به‌ گیان
نه‌سره‌وم تاکوو بمێنم
دوژمنانت بتارێنم
تۆڵه‌ی ئاواره‌ و کوردستان
گشت به‌شخوراوانی جیهان
له‌ داگیرکه‌ران،
بسێنم

سه‌قز - ١٣٥٧



# گیانی شیرینم

## «کۆبانی»

لووتکەی هەڵوێستی ئینسانی
گیانی شیرینم
"کۆبانی"
دڵم، چاوم،
هەوێنی شیعرم
هەناوم
شکۆداری، گەشی، بەرزی
دارستانی،
باخی، ڕەزی
لانەی شێر و
هەڵۆ و تەوار و تەڕلانی
گیانی شیرینم
"کۆبانی"
تۆ کاکڵی واتای ژیانی
ژیلەمۆی ئاگری زەردەشت،
هەیڤی، تاوی



شاخی، دەشتی
باهۆزی،
برووسکەی، هەوری
چۆک بە مردن دائەدەیت و
واتای داکەوتن
نازانی
گیانی شیرینم
"کۆبانی"
مەکۆی خورتی ڕەند و کیژی ڕندی
دوندی
لووتکەی چیای
سەرهەڵدانی
بلاوێنی، گەشی، ڕوونی
مانای پیرۆزی " هەربوونی"
شادەماری کوردستانی
گیانی شیرینم
"کۆبانی"
مۆسیقای، شمشاڵی، بەستەی
زایەڵەی خۆشی حەیرانی
قەڵای، شوورەی، بای
گڕکانی

پەیامی سەوزی سەربەستیت

لە جێژوانی

وەک گوڵدانی

ڕازێنەری پەنجەرەی هەموو ماڵانی

گیانی شیرینم

"کۆبانی"

گەردەلوولی، خۆڕاگری

کەڵاتی ورە، و

ئاگری

وەشتی، شەماڵی

زریانی

شریخەی هەور و بارانی

لە لەشمانا

خوێنی، گیانی

بۆ هەتا دنیا دنیایە

بە ناوچاوانی مێژوودا

شائەستێرەی

شائەستێرەی،

درەوشاوەی بەرخۆدانی



ئۆتاوا، ڕەزبەری ٢٧١٤، ئۆکتۆبری ٢٠١٤

# گوڵاڵەی عەفرین

وا نسار و کەژ و شاخی بەفرین
سوورە بە خوێنی گوڵاڵەی عەفرین

دۆت و خورتی دەڤەری باز و تەوار
چنگ بە گرِ، ڕوو لە چیا و لووتکە فڕین

تاکوو ئاسۆگی گەشی بەرخۆدان
بڕەوێ و هەرد و سەما بێنە هەژین

شاخ و پێدەشت و بنار و لاپاڵ
پڕ هەڵۆی ڕەند و تەواری شیرین

سەر، تەژی خەونی وەشی ئازادی
دڵ، پڕی سۆز و تەشی ئەشق و ئەڤین

تا بەدی بێ خەوی سەربەستی کورد
بژی " کۆبانی"، بمێنێ " عەفرین"

ئۆتاوا، ٤ی ڕێبەندانی ٢٧١٧

پێشکەشە بە «نەڤال کۆبانی» یەکەم
تەواری شەهیدی بەرخۆدانی عەفرین

# گوڵی «عەفرین»

ژیانت باش

گوڵی «عەفرین»

کوانووی خەونەکانت کڵ

دڵت خۆش و سەرت سەوز و

بزەی لێو،

قەت نەکا لێت سڵ

هەناوت ناری دڵدارییی و

گەرووت،

گوڵخەندەرانی ژین

هەناسەت،

پڕ بەرامەی گوڵ...

٢٩ی بەفرانباری ٢٧١٧، ئۆتاوا

# هاوار

ئەی هۆی نەجاتی من لە غەم
دڵدارەکەی خاوەن کەرەم
بێ تۆ هەژارت دەم بە دەم
هاوار و گفت و گۆیەتی

پڕ بایەخە ژینم بە تۆ،
بۆ هەستی من تۆ بوویتە هۆ
دڵ بۆ ویسالی بەژنی تۆ
وا مەیلی ڕەنگ و بۆیەتی

بێ تۆ درەختێ بێبەرم
دێوانەیێ سەوداسەرم
خاوەن دڵێ بێ دڵبەرم
تەیری دڵم ڕۆڕۆیەتی،

دەردی منە هیجرانی تۆ
ڕووگەی منە چاوانی تۆ





دڵدارەکەی خاوەن شکۆ
دڵ، دادی وەسڵی تۆیەتی

خوێنی منە ڕەنگی گەشت
بەختی منە پرچی ڕەشت
شێتی هەژار و بێ بەشت
هاواری دەردی خۆیەتی

بۆ تۆ بە ڕەنجی بێوچان
ئەی نەرمەباکەی دەم بەیان
هەردەم، مەلی بێ ئاشیان،
بەم چەشنە پرس و جۆیەتی

سەقز، شیعری کۆن





# هاودڵی

هەر چی خزمت زۆر بێ ژینت بۆشترە

هاودڵیی، سەد قات لە خزمیی خۆشترە

ئۆتاوا، خەزەڵوەری ٢٧١٨



بۆ هاوژینی گوڵم، «مێهری»

# «هاوژین»

لە ژین لێوڕێژم، لە ژان ئەشقیام

شەپۆلی زەریام، ترۆپکی چیام

عومرێ هەژار و دەوڵەمەند ژیام

هاوژینی ئەشق و هەمنشینی گوڵ

بەختەوەرترین مرۆڤی دنیام



بەهاری ٢٧١٨، ئۆتاوا




ئەوا لە دوای بیست و حەوت ساڵ

سووتان و کۆکوژی و ئەنفال

چی هیوا بوو،

لە بار برا

«هەڵەبجە» مان بوو بە کێشەی بووجە و مووچە و

سەد جاری تر،

لە دار درا.

بوو بە فەرشی سووری دیوەخانی «کوێخا» و

لە ژێر پێڵاوی بکووژانی،

ڕاخرا.

بوو بە پەروار

بەرەو خوانی ئاغاکانی قوم و بەغدا

بەڕێ کرا

بوو بە «بابەکر» و «زێباری»

بوو بە کارتی مێزی یاری

بوو بە نەوت و

لە بۆری شادەماری پێنجهەزار شەهید

دەسخۆشانە،

بەرەو کۆشکی هەزارهۆدەی سوڵتانی تورک

چوو بە دیاری

ئەوا لە دوای بیست و حەوت ساڵ

تەڕاتێن و ئەزموونی تاڵ،

«هەڵەبجە»مان

بوو بە جەفەنگ

بوو بە سەرۆک ئەرکانێکی بێدەسەڵات،

بێدەرەتان،

گێژ و دەبەنگ...

بوو بە «مەعسووم»

بوو بە کورسی بن پاشەڵی

دوو بنەماڵەی ناچاری



بوو بە پەڵەی هەوری بارانی **دۆلار** و

بە سەر دوو حەوشەدا باری

بوو بە دەردی سەرباری دەرد

بوو بە قوربانی «**سەوز**» و «**زەرد**»

بوو بە پەن و گاڵتەجاڕی

ئەوا ئێمەش،

بیست و حەوت ساڵە چاوەڕێین

بۆ «**هەڵەبجە**» و،

بۆ دڵدانەوەی ئەنفالی

بۆ دواترووسکەی گڵۆپی،

چاوی کوژاوەی مناڵی

بیست و حەوت ساڵە چاوەڕێین

بۆ سارێژی برینی،

پێنجهەزار کۆتری شەلاڵی خوێن

لە بۆ دووسەدهەزار جەستەی،

بن خاک و خۆڵ

بۆ هەزاران ملی بە کوێن

بۆ هەزاران جەرگی بەبرین

بۆ هەمدیسان هەڵاتنەوەی تاوی هیوا،

لە شاخی ژین

بۆ سروەیەک بڕەوێنێ،

تەمی تەماویی گەرمەشین

ئێستا نەک زامی «هەڵەبجە» بە ناسۆرە،

بەڵکوو سەرباری ئەو زامەش،

لە چاوی کورسیپەرستان

کوردستان و شەهیدانی،

کەرکووک، شنگال و کۆبانی

خۆشەویستی و ڕێزیان ناگات

بە حەز و ئۆخەی دیداریێ،

لەگەڵ،

( قاسم سولەیمانی ! )

ئۆتاوا- ڕەشەمەی ٢٧١٤



# هەپیکاڵڕ

**خۆزگە ببوایەم بە «هەپیکاڵڕ»**
**لە نیو پەنجەتا بە بێ مشتومڕ**
**بەیانی تا شەو، شەو تا بەیانی**
**لە جیاتی «سێڵفۆن»، لە من بڕوانی**

**ئۆتاوا، ڕەزبەری ٢٧١٩**









هەپیکاڵڕ: ناوی جۆرێ گەمەی کامپیۆتێرییە کە لە سەر تەلەفوونی زیرەک، دەتوانی دایبەزێنی.

# هەشتا و هەشت

چیتان پێ بڵێم؟ خۆ فرۆش؟

خوێڕی؟.. خائین؟..

شەقوولەدۆش!..

پەرچی و دەڵە،

شۆڤار و جاش،

یا وەکوو،

نیشتمانفرۆش...

هەر چەن دەکەم جنێو بە باڵای تاوانی ئێوە ببڕم

وشە کورت و، ناتەواوە

ئەوەی لە دیوەخانی شێخانەی ئێوەی پەستا،

زۆر بەرچاوە

لە کەرکووکی دڵی کوردان،

ئەوەی کردتان و لە نێو ئێوەدا،

باوە

کەلەپوورە و،

لە شەست و شەش،



لە هەشتا و هەشت،

بەجێماوە

بەڵام ئێوە، کوا دەربەستن؟!..

بەڵام ئێوە، کوا دەربەستن؟!..

ئاورێ لە خۆتان دەنەوە

ئەوسا دەزانن چەن نەمە و نزم و،

پەستن

خۆتان بە خۆتان نازانن؟!...

بیست و شەش ساڵە بەردەستن

بیست و شەش ساڵە سۆزانی،

دەستاودەستن...

بیست و شەش ساڵی ڕەبەقە،

چاوشۆڕانە،

لە سەر پاشەرۆکی خوانی ئاغاکانتان

دەسماڵی گەڵ و،

ئاودەستن

زامی شنگال،

هێشتا خوێنی لێ دەچۆڕێ

کەرکووک،
هێشتا دەناڵێنێ
هەڵەبجە،
فرمێسکی لە چاودا نەماوە،
هێند گریاوە
بەڵام ئێوە،
بەڵام ئێوەی وڵاتفرۆش
کوا دەربەستن؟...
سەری شۆڕتان قاڵی قاڵە و،
بە بۆنی چاڵە نەوتەکان
مەستی، مەستی، مەستی، مەستن
چۆن دڵتان هات، دڵی کوردستان بفرۆشن
چۆن دڵتان هات،
ڕووتان لە ئاستی پێشمەرگە و شەهیدانمان،
دابپۆشن
دەک داڕزێن،
دەک داوەشێن
چۆن دڵتان هات بەر بدەنە گیانی کەرکووک،
داشەهارە
چۆن دڵتان هات ببنە نەشتەر،
ببنە چەقۆ،



ببنە پەت و کۆت و دەستبەند و،
سێدارە

هەموو، کەتنی هەشتا و هەشتە
هەموو، کەتنی هەشتا و هەشتە
ئێستا لە سایەی هەشتا و هەشت،
کەرکووک بۆتە دۆزەخی ژان،
بۆ گشت کوردان
بەڵام بۆ بەچکەشێخەکانی " دەباشان "
لەوەڕگەیە و باخە و بێستانە و،
بەهەشتە

سەرتان لە ئاخوڕی بەغداد
قوونتان لە باوەشی تاران
خۆتان بە خۆتان نازانن؟...
دە بڕوانن،
دە بڕوانن خێڵی دهۆ و درۆ و،
تاوان...
" ئاڵا "تان گۆشتی سەر شیشی گەڵی حەشد و،
" گەڵخۆشانە"ش،

بۆ سەرجەم بەچکە شێخەکان
کورسی پارێزگاری شاری،
ئازار و ژان
دەبا بەس بێ،
دەبا بەس بێ
ئەم ئازارە
گەر تۆزێ ویژدانتان ماوە
هەڵێن بڕۆن،
گۆڕتان گوم کەن،
لەم هەوارە
بڕۆن بڕۆن
هەتا سایەی شوومتان ون بێ
لە چاوی ئەم خەڵک و خاکە
برینداره،
بڕۆن و خۆتان هەڵواسن
بە شریتی حەرەمسەرا و،
بەنەخوێنی سولەیمانی و
قەیاسەی هادی عامیری و
خۆتان بدەن،
لە سێدارە...



ی خەزەلوەری، ٢٧١٧، ئۆتاوا



# نۆستالژی

تکا دوایین دڵۆپی هەستی لاوییم

نەما تینی دەروونی ئاگراوییم

لە سەر لووتکەی تەمەن چاوی دەگێڕێ

هەڵۆی پیری خەیاڵی حەسرەتاوییم

چەمان هەر دوو هەسێڵەی ئەشک و ئاوە

هەموو دەور و بەرم پڕ وردەداوە

نە هاوڕێی و نە هاوڕێ ما لە دەورم

ئەوەی مۆمی ئومێدە لێم کوژاوە

ئۆتاوا - بانەمەڕی - ٢٧١٥



# هەشتی مارس

چامەی ئەمڕۆم، چەپکێ گوڵە

بانگەوازە

بۆ خۆشەویستی، بۆ جوانی

گەل ئێوەمە

سەرجەم کۆمەڵگای ئینسانی

با پێکەوە چۆک دابدەین

سوژدە ببەین

بۆ بەرخۆدان، بۆ یەکسانی

بۆ ئازادی

بۆ خاک

بۆ «ژن»

بۆ تەوارانی "کۆبانی"



ڕەشەمەی ٢٧١٥



# هەوای دیدار

دڵ هەوای دیداری تۆی کەوتۆتە سەر
بۆیە ئاوا هەردەگێڵە و دەربەدەر
ئاخ بریا دەس بدات بێتە حوزوور
یا شەوێ ، یا بەربەیانێ بێ خەبەر

فاتێح موحەمەدی . ف - نامۆ

دڵ لە دڵ هەرگیز مەدە «نامۆ»ی بەڕێز
تا لە سەر هزر و لە لەش مابێت هێز
تاکوو هیوا مەشخەڵ و ڕێمان یەکە
تێدەکۆشم ، خەڵوەتی ناکەم پەرێز

زۆر دەبێ بمبووری من دوور بووم لە باخ
دیارە دیدار خۆش دەکا سکڵی دەماخ
بۆ من ئەو شانازییە کەی دەست ئەدا
وردە بەردێ بێت بۆ پابۆسی شاخ !

۲۰۲۰، ئۆتاوا



پێشکەشە بە ڕاپەڕینی هەولێر

# هەولێر

# ئەمجار نۆرەی تۆیە

هەولێر ئەمجار نۆرەی تۆیە

بدەیتە بەر شەقی شەرەف

ئەو دەسەڵاتە گەندەڵەی

کە تان و پۆی

هەموو،

تاوان و دەهۆیە

نۆرەی تۆیە





به شەپۆلێ ڕابماڵی

ئاغای تورک و،

کوێخای لاره ملی کورد و،

هێلانەکانی «گویلەن» و،

ماڵەکانی «فەقێ عەلی» و، حەرەمسەراکانی،

سەرۆک ئەوقافەکان

پاکژی کەی،

شاخ و بنار و دارستان

له ڕەگ و ڕیشه دەربێنی

چی بوونەوەری بێگانەی داگیرکەره و،

چی «مڵە»یه

له خاکی پاکی

«کوردستان»...

ئۆتاوا، ٥ی خاکەلێوەی ٢٧١٨



# هیوا

من ڕووبارم، ڕێژنەم، تینم

تیریێژی تاوی ڤەژینم

هەورم، برووسکەم، ئەوینم

وەشتی

بە لێزمەی بەهارم

دادەبارم

هیوای هەڵدانەوە و،

ژینم

من کۆتری ئاشتیم،

ڕۆژئاڤام

من گەریلام

من،

«عەفرینم»...

ئۆتاوا، ٢١ی بەفرانباری ٢٧١٧



# این چه حرفیست؟...

این چه حرفیست که در عالم بالاست بهشت

هر کجا وقت خوش افتاد، همانجاست بهشت

دوزخ از تیرگی بخت درون من و توست

دڵ اگر تیره نباشد، همه دنیاست بهشت

( صائب تبریزی )

چ وتارێکە دەبێژن کە لە ئەولایە بەهەشت!

خۆش کە ڕابوێری لە هەر وارێ، هەر ئەویایە بەهەشت

هزر و بیری ڕەشی مە دۆزەخە واتەی ئەگینا،

دل ئەگەر بێ غەل و غەش بێ، هەموو دنیایە بەهەشت

ئۆتاوا - بانەمەڕی ٢٧٢٠



# ئیستیغفار

خوشکی بەڕێزم، بۆ بە فەرتەنە
دوو دەستی منت خستە ناو خەنە !

بۆ کاریٚ وات کرد منی قەڵەم شڕ
تەک زاتی شێخا کەومە مشتومڕ!

بیٚ ئاگا لەوەی شێخ بێتاوانە
خۆم دا لەو هێڵەی بۆ من پاوانە

لە سەر دۆسیەی ژێرخان و شلەنگ
لەگەڵ ئەو زاتە منت دا بە جەنگ!

کەوتمە داویٚ بە هۆی کەتنی تۆ
دەبیٚ بشکێنم «کاڵەک بە ئەژنۆ»

ئێستا چۆن ڕووم بیٚ منی تاوانبار
داوا کەم لە شێخ تۆبە و ئیستیغفار؟ !



شێخێ کە ئاوا ساز و دڵتەڕ بێ
ئامانجی تانە و گیرۆدەی شەڕ بێ

ئەهلی سەڵات و نوێژ و تاعەت بێ
هەر ڕەکعەت نوێژی دوو سێ ساعەت بێ

قیبلەی بگۆڕێ و بۆ نوێژ و تاعەت
لە ژوور دەرکەوێ و هەردەم و ساعەت

بێت و دابەستێ نوێژ لە گوڵخانە
سوجدە بەرێتە بەر ئەو شۆخانە

چێژ بەرێ هەردەم لە بینینی گوڵ
سینگ و قۆڵی ڕووت بێهێنێتە کوڵ

حەز کا بخەملێ باخچە و ناو حەسار
بێنە پێش چاوی، کچ بە لەنجەولار

ئەسڵ و فەرعی دین لێی بێ تێکەڵاو
دەرچێ لە دەستی ڕەکعەت و حەساو

ڕێژەی ڕەکەعات لێی بێ درێژ
«تەراوێح» بکات بە ئادابی نوێژ

خزمەتی حەوشە و دار و باخ و گوڵ
غافڵی بکات لە ئەهلی مەنزڵ

هێندە پەرۆش بێ لە بۆ ئاودێری
هیچ کات لانەچێ بەرماڵ لە ژێری

زاتێک و وەها ڕەوت و ئاکاریێ!
خاوەنی وەها کردە و ڕەفتاریێ!

چلۆن دەتوانێ شلەنگ داشاریێ!
هەی بەردی عالەم لە من بباریێ...

ئێستا من چ بکەم لێم ببێت ڕازی؟
بۆچی وا بە لەز من چووم بۆ قازی!؟

چۆن ڕووی خۆم ڕەش کرد لە ئاستی شێخا!
یا خوا زمانم بکرێ بە مێخا...

بۆچی من وام کرد، بێ ئاگاداری
بارانی تەوسم بە شێخا باری

کردم هەجوی زۆر بێ وەی بزانم
ئێستا ڕووزەرد و زۆر پەشیمانم...



## بەڵام...

بەڵام دڵشادم بەوەی خاڵە شێخ
گۆشت و کەبابی خۆی داوە لە سێخ

بە پێچەوانەی ئەو بوختانانە
سەربەرز هاتە دەر لەم ئیمتیحانە

خۆی لە بەرپرس بوون قەت نەکرد جویٚ
یەک جاریش ئەرکی نەخستە پشت گویٚ

دەری خست بۆمان ڕێی ئەمەگناسی
ناکریٚ چاکەی ئەو قەت بە دەم، باسی

سەلماندی پێمان چەندە گەشبینە
شێخی وا خۆش بیٚ لەم سەر زەمینە

شێرانە بڕی قۆناغی ئەزموون
من و شیعریشم لە ئاستی، مەغبوون

ئۆتاوا، گەلاوێژی ٢٧١٩

بەرپەرچدانەوەی شیعری پێشووم بەناوی:
«شێخ و شلەنگ»



# ئیتر پێناکەنم هەرگیز

نەمن ئیتر بزەم نایەتە سەر لێو و
به دڵ پێناکەنم هەرگیز
ئیتر پێناکەنم هەرگیز
له ڕووی بێ چاو و ڕووی ئێوە
ئیتر هەرگیز بە ئاسانی،
دڵم نادەم
بە ئێوەی لەشفرۆشی پەستی سۆزانی
کە هەر دەم ڕوو له ڕووگەی خاوەنی زێڕ و تەلارێکن

ئیتر هەرگیز دڵم نادەم
بە ئێوەی بێبەزەی سپڵە
کە هەر ساتێک
گوڵی نێو باوەشی خێوی دۆلارێکن
بە ئێوە کە،



بە پانتایی

هەموو دەشت و دەری پڕ مەینەت و ئازاری ئەم خاکە

دەبارێنن بە خوڕ

بارانی ڕەنگامەی درۆکانتان

بەسەر زەریا و

بەسەر سارای ئومێدی بێبەرینی

ئەم گەل و تاکە...

بە ئێوە کە،

لە ناو هەرد و

لە زار و شۆڕەکاتی دێمی ئەم چاخە

بە فرمانی خودانانی دۆلار و زێڕ و سەرمایە

دەچێنن نائومێدی و تۆمی بێزاری

بە ئێوەی پەستی بێ مایە

سەماکارانی سیحر و سازی بێگانە

کە وا سەرخۆشی شەهوەت

لەم (کەسەر خانە)

بە لاساری،

دەکەن شایی لەسەر لاشەی هەزار پارەی،

هەژاری و

فەقر و بێکاری

بەڵێن بەو ئاگرەی ناخم،

بەڵێن بەو ئاگرەی ناخم

کە تین و تاوی سووتاندی

لە قووڵایی دەروونی پڕ لە هیواما،

هەموو تۆمی کەساسی و نائومێدی و

حەسرەت و داخم،

کە من هەرگیز

لە ڕووی ئێوەی هەزار تاوانکەری بێ چاو و ڕوو،

پێناکەنم هەرگیز

خەریکن بادەدەن خۆتان و سەرقاڵی سەمان!

ئەمما،

بە چاوی خۆم دەبینم

چۆن لە شەپڵەی مەرگ تۆقاون

دەبینم چاوی مۆلەقتان

دەبینم چۆن لە ئاست لێمشتی تۆڵەی گەل،

قەتیس و پەست و،



داماون

دەبینم چۆن زراوچووی گێژی گەرداون

ئەمێستاکەش،

دەبینم چۆن لە ناخی ئەم (خەمستانە)

هەواڵی خۆشی ئازادی،

شنۆیەکی بلاوێنە و،

ئەدا دڕ،

بەم شەوستانە

منیش هەر چەند بە وێنەی هاوەڵانی ڕێی خەبات

یەخسیرم

و پابەند و زیندانی،

بەڵام پێناکەنم هەرگیز،

بەڵام پێناکەنم هەرگیز

لە ڕووی ئێوەی دز و جەردەی،

مەرام

و هزری ئینسانی...

وەرگێڕدراو لە شیعرێکی «کارۆ»

کانادا- ئاگۆستی ٢٠١٥

# جیکەجیک

هەمە ماشینێ، بردم بۆ مەمی
تا ڕۆنی تێکا و بگۆڕێ شەمی

پاشان بۆم دەرکەوت باڵجۆینتی کۆنە
گۆڕای باڵجۆینت و تێی کرد لەو ڕۆنە

دوو دیسکی تازەی خستەپاڵ تەگەر
تورمزی گۆڕا، نەما دەردیسەر

زۆر بە دڵسۆزی کاری کرد تەواو
بەتکایەکی زۆر وەریگرت حەساو

لەپاش چەن ڕۆژێ دیم دەنگی جیکە
دێ لەو دیسکانەی وا تازە و شیکە

بەعەرزم گەیاند ئەو وەزع و حاڵە
سەیرم کرد دەستی کرد بەسکاڵا

فەرمووی کە جەکی دوکان شکاوە
جەمسەری فیکرم یەکسەر لەقاوە



ماشینێ لە عەرز، یەک بە حەواوە
شاگردێکم هەس ئەویش زۆر خاوە

بەهەرحال، هاتە پێش خاڵە مەمی
بەڵێنی پێدام بە خاترجەمی

کە بەم زووانە دەکەم تەلەفوون
تا بێی بۆ دوکان بەبێ مەحتەل بوون

تەعمیری بکەین ئەو جیکەجیکە
کە وەها فیکری تۆی پێ خەریکە

هەر جەکەکەمان چاک بکرێتەوە
یەکەم، سەیارەی ئێوە دێتەوە

ئەمنیش بە دڵ زۆر لێم کرد سپاس
هەر وەکوو دۆستێ باش و ئەمەگناس

ئێستا سێ حەفتەس کە من چاوەڕێم
تا خاڵە مەمی دەنگی بێتە گوێم

هەرچەند ماڵیشی زۆر لێم نزیکە
بەڵام هێشتا هەر لەگەڵمە ، جیکە

نازانم هێڵی فۆنی خراوە
یا وەکوو، ئێمەی لەبیر نەماوە

یا خوانەخواستە حەوت قورِعان لە بەین
بووە دوچاری فەرامۆشی زەین

یا دیسان چەکی لێی دێ تەقەتەق
فیکر و هەواسی ئەوی کردوە لەق

بە کورتی، منیش بیرم شێواوە
سەرم لەم ئیشە تەواو سوورِ ماوە

بۆیە بە چەکی شیعر و هۆنراوە
هاتمە مەسافی ئەو گەورەپیاوە

چونکە دەزانم زۆر ئەدەبخوازە
حەزی لە شیعر و مۆسیقا و سازە

ویستم بەم چەشنە لێی ببم نزیک
تا خەلاسم کات لەدەست جیکەجیک

ئۆتاوا ١ ی جۆزەردانی ٢٧٠٨

٢١ ی مەی ٢٠٠٨



# ژوانی کۆتایی

وا لە دانەی (شەستم) و کەڵکی نەماوە (داو)ی من
هاتە بەر چاوم کە چەن خێرا بوو ئاوا تاوی من
چۆن بە تاوونی حەسرەتا چوو ئەو دڵەی داماوی من
گەرچی تا ئەژنۆ لە قوڕدام کاتی دیدارت بەڵام
خاکی بەردەرگەت دەوایە بۆ دڵی سووتاوی من

ڕۆیی، تۆرا بولبولی تەبعی تەڕی پاراوی من
وا تەرە و تەنیا بەجێما، ئەو دڵەی تاراوی من
چاو کزە و گوێ نابییەت، ئیتر نەماوە باوی من
گەرچی تا ئەژنۆ لە قوڕدام کاتی دیدارت بەڵام
خاکی بەردەرگەت دەوایە بۆ دڵی سووتاوی من

دادەبارێنن لە دووریت ئەسری گەش دوو چاوی من
جێی لە سەر کوانووی فیراقە جەرگی هەڵقرچاوی من
خوێن دەداڵێنێ دڵەی پڕ حەسرەت و زووخاوی من
گەرچێ تا ئەژنۆ لە قوڕدام کاتی دیدارت بەڵام
خاکی بەر دەرگەت دەوایە بۆ دڵی سووتاوی من



کوا شنۆی وەسڵت کە ڕابا هەوری یاو و تاوی من
بێت و ڕاماڵێ گەوارەی ئەو دڵەی تەنگاوی من
دەرکەون بەدر و هیلالی ئاسمانی ساوی من
گەرچی تا ئەژنۆ لە قوڕدام کاتی دیدارت بەڵام
خاکی بەردەرگەت دەوایە بۆ دڵی سووتاوی من

ماوە هێشتا تامی ماچت لەو دەمەی تاساوی من
هەر بەجۆشە بۆ ژوانێ، هەستی هێشتا لاوی من
داخەکەم لێی دوورە سێ بەژ، نایگەنێ هەنگاوی من
گەرچی تائەژنۆ لە قوڕدام کاتی دیدارت بەڵام
خاکی بەردەرگەت دەوایە بۆ دڵی سووتاوی من

تا بمێنم هەر لە ڕێتە چاوەکانم، چاوی من

بێیتە ژوان، دیسان بلاوێنی دڵەی ژاکاوی من

جێ بمێنێ گیان و دڵ، ڕۆح و سەر و پێڵاوی من

گەرچی تا ئەژنۆ لە قوڕدام کاتی دیدارت بەڵام

خاکی بەردەرگەت دەوایە بۆ دڵی سووتاوی من

ئۆتاوا- بەفرانباری ٢٧١٤ ی کوردی

ئەم شیعرە تێهەڵکێشێکە لە تاکە بەیتی:

گەرچی تا ئەژنۆ لە قوڕدام کاتی دیدارت بەڵام

خاکی بەردەرگەت دەوایە بۆ دڵی سووتاوی من

ساڵی ١٣٥٣ لە سەقز لە ژوانێکدا تایەک لە پێڵاوەکانم

بەجێما و من ئەم تاکە بەیتەم هەر لەوێدا ساز کرد و

حەزم کرد ببێت بە پردێک لە نێوان تەمەنی ٢٠ و ٦٠ دا.

ئۆتاوا- بەفرانباری ٢٧١٤ ی کوردی

١٩ ی ژانڤیەی ٢٠١٥ ی زایینی






# بۆ مۆسیقا

تۆ ژیواری ڕاستەقینەی ، تینی تاوی ژینی منی

تۆ شنەی لابەری تەمی چەمی پڕ ئەسرینی منی

تۆ گەشەی مەبەستی هەستی مەستی ئاگرینی منی

تۆ هەوێنی شیعر و بەستەی ، مۆسیقای ، ئەوینی منی

سەقز ، ١٣٦٤ی هەتاویی

# بەڕێز کاک خالید

بەڕێز کاک خالید، سپاست دەکەم بۆ ئامۆژگاریت

بۆ وشەی جوان و بۆ دڵی تەڕ و بۆ ئەمەگداریت

بە سەر چاو، بەڵام هەوڵی بێسوودە، پووک و گۆپکەی بەی

کوجامەرحەبا، ددان سوواوە، بۆ ئاگاداریت!..



# کاوێژ

چی سەیر ئەکەم
چی دەڕوانم
لایێ دەنگۆ و
چاوەڕوانی و
هەرا و ئاپۆرە و
ڕاوێژن
لایێ دیکەش
تاقمێ بژاردەی خۆبادەر
بۆ ئەوەی،
گۆمی پەنگخواردووی حەزی کۆنیان
بشڵەقێنن
بوون بە کوورەی کڵی وتار
بوون بە دەمڕاستی ئەم گەلە و
بە سەر ئاوا
خشت ئەپێژن
لە نێو ئەم تاقمە بژاردە
تاکە قەڵەمێ شک نابەم
کە مەبەستی لە ئازادی،

( ڕزگار بوون ) بێ

تاکە وتارێ نابینم

کە مەبەستی

جیا لە درێژدادڕی،

( سەرفرازی ) و

( سەرخۆبوون ) بێ

زۆربەی زۆریان

کۆی باس و نووشتە و وتاریان

ژاوەژاوێکی بێ هێژە

تەنیا،

بە خۆدا هەڵدان و

خۆبادان و

هاتەرانێکی بێ چێژە

سەر و بنی فەرموودەیان

پەسا پەسا

هەڵهێنانەوە و

وڕینە و

ڕاوان و لافە و،

کاوێژە

پووشپەڕی ٢٧١٨، ئۆتاوا

بۆ «نیشتمان حسێن پەناهی»

# کازێوە

کە ڕەشە با هەڵیکرد و،

تاوی سەند و،

بای دایەوە...

مۆمێک، لە کازیوەی «سنە»

دەمەو بەیان

کوژایەوە

کە شەو داهات...

باڵای کرد و

بوو بە کڵپە و تین و هەتاو

بوو بە گڕ و،

لە نێو ئاگردانی ماڵان

سەر لە نوێ،

داگیرسایەوە...

١٢ی گوڵانی ٢٧١٨



# هەڵە

که من هەڵەم کرد مەیکە بە شایی
تۆش هەڵە دەکەیت ئێستا یا دوایی
ئامۆژگاریم کە ، بڵێ ڕاست وایە
بیرت بێ ڕۆژان ، ڕۆژی لە دوایە

پیرەمێرد

تەمەن هەڵکشا و هەڵە دوایی هات
ئەزموون چی هەبوو ، گشت کۆتایی هات
گەلێ بە نرخە پەندی پیرانەت
بەڵام داخەکەم لە دوای شایی هات

ئۆتاوا - گەلاوێژی ٢٧١٩

# کە تۆم بێ

کە تۆم بێ کوا کەسەر ؟ کوا خەم ؟ کوا دەرد ؟
سەری هەر سێ ، لە سێ سندان و سێ بەرد

ئۆتاوا - ڕەزبەری ٢٧١٨

# که زارۆکێ پێدەکەنێ

که زارۆکێ پێدەکەنێ

هەموو دنیا ئەبێ بە گوڵ

که تفەنگێ ئەشریخێنێ

دنیا و گوڵ و بزە و زارۆک

دەوەرێن و

تێکڕا دەبن

بە هەنیسک و فرمێسک و کوڵ

ئۆتاوا، خەرمانانی ٢٧١٨



# کەس
# نیشتمان جێ ناهێڵێ

کەس نیشتمان جێ ناهێڵێ
بەڵام چ بکەی کاتێ کە زێد
زێدەوانی مەرگ و کۆچ و
حەکایەتی
گۆڕەوشارە
کەس نیشتمان جێ ناهێڵێ
بەڵام چ بکەی
کاتێ کە خاک
چیتر لە ئامێزت ناگرێ و
لە هاوڕێ بوونت
بێزارە
کەس زێد و خاک جێ ناهێڵێ
بەڵام چ بکەی
کاتێ کە زێد
گەرووی ئاواڵەی نەهەنگ و
زاری





پڕئازاری مارە
کەس نیشتمان جێ ناهێڵێ
بەڵام چ بکەی
کاتێ کە ئامێزی دەریا و
پیلی پێلی سامناکی زێ
ئاسوودەتر
لە،
کەنارە

کەس زێد و خاک جێ ناهێڵێ
بەڵام چ بکەی
کاتێ شنۆی کاوان و شاخ
مۆسیقای مەرگ و
جەخارە
ئەو دەمەی کە
هەناسە و دەم
بەستەڵەک و
زووخاو
لە ڕەگ و،

دەمارە

کەس نیشتمان جێ ناهێڵێ

بەڵام چ بکەی

کاتێ کە چاو لە گلێنە و

گوڵ لە بەهار

دڵ لە سینە و

زمان لە زار

لێو لە ماچ و

گوێ لە نەغمە و

هەست لە جوانی و

لە خۆشەویستی،

زگارە

کەس نیشتمان جێ ناهێڵێ

بەڵام چ بکەی

کاتێ دار و بەرد و هەرد و

چیا و ئاسمان

بست بە بستی سارا و کوێستان

لێت نەیارە

کانیاو لێڵ و

چەم تاڵاو و

دارستان و باخ و درەخت





## تاپۆی داوەڵ و،
## سێدارە

کەس نیشتمان جێ ناهێڵێ
بەڵام چ بکەی کاتێ کە خاک
لە هاوڕێ بوونت
بێزارە
کاتێ کە زێد
گەرووی ئاواڵەی نەهەنگ و
زاری پڕئازاری مارە
کاتێ
کە ئامێزی دەریا و
پیلی پێلی سامناکی زێ
ئاسوودەتر
لە،
کەنارە...

**١٥ی خەرمانانی ٢٧١٦، ئۆتاوا**

بۆ ئالان کوردی، پەپوولەی ساوای بێتاوانی کورد
کە گیانی ورد و پەمەیی لە کەنارەکانی دەریای
ئێژەدا، ئارامی گرت.

# کەیك

ئانیەنی تازە و چیکن و

ستەیک

گەنجە لێکی دا بێ هەڵە و

میستەیک

پیتزا هاتە دەر هەر لەچەشنی

کەیک

ئا ئەوە چییە لە بۆ خودا

سەیک ..!

هەر کەسێ بیخوا دڵی دەکا

شەیک

ڕزگاری دەبێ لە خۆراکی

فەیک

دوکان ۲۰۰۷ - ئۆتاوا - کانادا





# کڵاوی وادە

شیاوی ڕامان، پڕ سەرنجپێکە
لە باوەشدا گوڵ، لە دەستا پێکە
بۆ خۆیان دنیا و چی مەزە و کەڵکە
کڵاوی وادەش، وا لە سەر خەڵکە

ئۆتاوا، بەفرانباری ٢٧٢٠

بە بۆنەی «ڕۆژی دایک»،
پیشکەش بە ڕەوانی بەفرینی دایکی زۆر ئازیزم





# کۆڕۆنا و بەزمەکانی

یادی بەخێر پێش «کۆڕۆنا»
هەموو ،
بەهانەمان وا بوو
ژیان سەختە و
کاتمان نییە و
زۆر سەرقاڵین
بەڵام ئێستا ...
بەلام ئێستا کە کڕ کەوتووین و
لەماڵین ...

پەیوەندیشمان ،
وەکوو خۆمان کڕ کەوتووە و
لە سەر هێلکەی خەیاڵاتا
چاوەڕوانی
هەڵهێنانی
دۆخی تازەی ،
«دیجیتاڵین» ...

ئۆتاوا ، خاکەلێوەی ٢٧٢٠

# کۆڕۆنا

دەستی عالەمێ درا بە ڕۆنا
کاتێ تەشریفی هێنا کۆڕۆنا
خێرا خۆی خنی بە هەموو شۆنا
ڕایماڵی پەنجەی بە تازە و کۆنا
بێ جیاوازی لە هەمووی ڕۆنا

پێکای هەژار و دارا بە یەک جۆر
ملهوڕ و ملکەچ، زۆردار و بێ زۆر
سپی و زەرد و ڕەش، کاڵ و مۆر و بۆر
چۆکی پێ دادان لە ژێر هەتا ژۆر
لە زانا و پسپۆڕ، بوو بە گرێی کۆر

پەڕاوێزی کرد گشت تاکی دنیا
هەر کەس لە سووچی ژوورێکا مەنیا
ڕیشەی هاتوچوو، بە جارێ کەنیا
نەما ئامەشۆ، هەوای خەم ژەنیا
کەیی و دستەڕۆ، ماینەوە تەنیا



دایخست کەنیسە و کڵێسا و مزگەوت
دەمی سەڵا و بانگ ، هەموو لە گۆ کەوت
مێشکی ماندوومان ماوەیەک سرەوت
کەوتنە سەما نرخی ئەرز و نەوت
بازاڕ گەشاوە ، گەل قڕی تێکەوت



هیچکەس جێ نەما ، هەموو «ئەقلی کول»
لێیان هەڵماڵی ، باسک و قاچ و قول
بوونە پسپۆڕی بواری ئەلکول
«وایتێکس» تێکەڵ بوو لەگەڵ سرکە و مول
بڕێ پێی مردن ، بڕێ گێژ و خول

هیوام وایە لەم ئاڵۆز بازاڕە
بەر بگیرێ بەم شێوە کوشتارە
لە بری نووشتە یان ئیستیخارە
زانست بێتە گۆڕ بۆ ڕێگا چارە
چیتر قڕ نەبێ گەل بەم ئازارە

ئۆتاوا ، خاکەلێوەی ٢٧٢٠

# لاساری



فاتێح موحەممەدی . نامۆ

بەسیە ئەی گوڵ ، هێندە لاسارییی مەکە
دڵ شکێنی و ئاشق ئازاری مەکە
ئەشق کاڵاییکە بایی هەڵنەگر
بەو گرانە کاری بازاڕی مەکە
تا نەڵێ گوڵ بێوەفایە و بێ ئەمەگ
ڕۆحی بولبول تووشی بێزاری مەکە

# نازداری

وەڵامێ بۆ کاک فاتێح موحەممەدی



گوڵ بە عیشوە شۆرەتی دنیای تەنی
چونکە شۆخ و دلڕفێنە ، ئەزبەنی
تاکوو ناز و دلڕفێنی گوڵ نەبێ
چۆن دڵی شاعیر دوچاری کوڵ ئەبێ !
بولبولیش شوهرەی مەقام و بەستەیە
گوڵ هەوێنی ئەو چریکە و هەستەیە
بۆیە «فاتێح» ئیشی چامەی زارییە
چونکە دەردی بولبول و ئەو کارییە

ئۆتاوا ، خەرمانانی ٢٧٢٠


لەشپۆش
دیمەنی سیحراویی باڵا ، چی جوانییە ، لێی ئاڵاوە
هێشی گۆنا لە خەرمانەی ئەگریجە و زوڵفا نەخشاوە
گوڵووکی کوڵم و لێو و چەم لە ئەینۆکا دەچریوێنن
لە تونی گوڵپەڕی لەشپۆشا، هەتاری مەم چرۆی داوە
حەسەن شاتیی - ئۆتاوا - رەشەمەی 2715

# لەو ڕۆژەوە

لەو ڕۆژەوە ،
دەسەڵاتی ڕەشی پارە و
پاوانخوازیی و دراو هاتن
مرۆڤ ،
شوێنی خۆی لێ ون بوو
لەو ڕۆژەوە ،
پاپ و موفتی و
ڕەبا و قەشە و
مەلا هاتن
دنیا و ژین و واتاکانی
سەراوبن بوو
ئێستاش هەموو چاوەڕوانین

ئەنگوستێ ،
یا خود گۆچانێ
یان هەناسەی جادووزانێ
ڕۆحی نوێمان لە بەر کات و
پێمان داتەوە ،
وچانێ

بەڵام هەموو هەر خۆمانین
هێز و بڕست
گۆچان و هەناسە و ئەنگوست
وزە و هزر و
هەر چەشنە پێچم و،
گۆڕانێ ...

ئۆتاوا - خاکەلێوەی ٢٧٢٠




هەڵکەوت ئێوارەیەک هاوین
لەگەڵ سەعا و سیا و ئەوین
کاکە و عیماد و کاوەی ژیر،
ڕێمان کەوتە ناوچەی ئەوین

پاشان چووینە شاری قومار
کانگای کیژی تەڕ و لەبار
پاراومان کرد هەستی تینوو
بەسەیری لەش و لەنجەولار



گۆنای گوڵاڵەی کێومان دی،
زەردەی شیرینی لێومان دی
لە بەهەشتی لۆنای تاران
قۆخ و شڵانە و سێومان دی

چاو دەخشکا بە بێوچان
لە گەردن و کوڵم و لێوان
لە سەر لەنجەی کەمەر گۆشتن
زەق دەبوون چاوی مۆلەقمان

سای گەردنی بێگەردمان دی
سینگی نەرم، دڵی بەردمان دی
قاقای خەندەی کیژی دڵتەڕ
لەگەڵ عیمادا، دەردمان دی

ئەوسا ڕێکەوتین دوو بەدوو
مەبەستمان سەیری مۆتۆڕ بوو
بەرانبەرمان ڕاوەستابوو،
شۆخێ، کە کانگای جوانی بوو

چووین ڕاوەستاین لە سەر دیوار
ڕووبەڕووی کەنیشکی نازدار



هێند گیرۆدەی جوانیی ئەو بووین،
نە " پیست " مان دی و نە مۆتۆرسوار

کوڵمی گەشمان دی و مانگی ڕوو
چاوی ڕەشمان دی و پێچی موو
لە " پیست "ی نوێنگەی مۆتۆڕدا،
ئەوەی نەمان دی، مۆتۆڕ بوو

ماوەیەک لە پیست، ڕاوەستاین
هەرچی دەنگیان داین، هەڵنەستاین
تا تێر سەیری کوڵمی گەش بووین
لە خوا و لە حیزبی، نەترساین

شۆخی دڵڕفێنی نازدار،
ڕۆیی و بەجێی هێشتین خەمبار
لە ئاکامدا، هاتینە خوار
مل کز، گەردن کەچ، کۆڵەوار

گوتمان هەست و هۆ ش و بڕوا
بەدەست چاومەستان با بڕوا
بەڵام بەپێی ڕێسای سروشت
شادی دەمێکە، دێ و، دەڕوا

کۆتایی بەهاری ١٣٦٢ هەتاوی - تاران

# لم و شەپۆل

**شێرکۆ ئەڵێ:**

**لە بەستێنا، ئێمە «لم» بووین**
**بچووکترین منداڵی شا**
**بە چیلکەیەک،**
**«پایان»ی،**
**لە سەر دەنووسین...**

**منیش ئەڵێم:**

**بەڵام ئێستا «لم» نەماوین**
**شەپۆلێکین بە سام و، خوڕ**
**ڕادەماڵین بەرەو نوا**
**چی لەسەر رێی سەربەستیمان،**
**ڕابوەستێ**
**کوڕی «شا» بێ،**
**یا،**
**کوڕی «خوا»...**

**خاکەلێوەی ٢٧١٧ ئۆتاوا-کانادا**

# لێمگەڕێ

ئەی نیگارا ئاشقی و دێوانەگی کاری منە
لێمگەڕێ تاکوو لە ئەشقت ئاشق و دێوانە بم

لێمگەڕێ تاکوو لە داغت جامی مەی بگرم لەدەس
تا لەگەڵ دەرد و پەژارە بۆ دەمێ بێگانە بم

پێچی کەزیەت بەند و پێوەندی دڵی بێچارەیە
لێمگەڕێ با من ئەسیری بەندی ئەو زوڵفانە بم

نێرگیزی بێ گەردە ڕووت و بۆنی تۆ ڕێحانەیە
لێمگەڕێ با باخەوانی نێرگیز و ڕێحانە بم

لەیلەکەم شەوقی ڕوخت شەمعی شەوی تاری منە
لێمگەڕێ با قەیسەکەی مەجنوونی ئەم دەورانە بم





تفڵی بیماری دڵم دەگریْ گڕوو بۆ چاوی تۆ
لێمگەڕێ با من غەریقی بەحری ئەو چاوانە بم

کونجی میحرابی برۆت قیبلەی دڵ و دینی منە
لێمگەڕێ با سەر بە سوجدەی ئەو برۆ قەیتانە بم

لێمگەڕێ تاکوو لە لێوت شەهدی شانی هەڵمژم
تا نەمەکگیری شەرابی ئەو دەم و لێوانە بم

تۆم دەوێ تەنیا لە ژینا ئەی گوڵی سووری ئەوین
لێمگەڕێ با من لەگەڵ زۆر و کەما بێگانە بم

گەر بکەی ڕەحمێ بە ئەشکی چاوی گریانی ئەمن
شەرتە تا حەشری خودا تۆ شەمع و من پەروانە بم

سەقز ، شیعری کۆن



# مادام موسیبە

لە من داوا کرا شیعرێ بنووسم
وەکوو نەخشی قەدیمی سەر کەتیبە

بەیانی کەم گلە و دەردی ئەوانەی
کە خاوەنکار لەگەڵیان ناتەریبە

مەبەستم شوێنی وان فۆڕ وانی «بانک» ـە
کە تێیدا کاریگەر ئێجگار غەریبە

هەموو جارێ کە خاوەنکار ئەبینن
کە چەشنی ئاڵەتی توند و لەهیبە...

لە ترسانا شەقوولانیان، دەبێ جووت
زمانیان لاڵ و مردنیان، قەریبە

لە ئاستی هەڵمەت و زیقەی دوکاندار
درایڤێر، دەستەڕۆ و زار و حەریبە

لەشی هیلاک و ماندوویان هەموو ڕۆژ
لە یەک چرکەش پشوودان، بێ نەسیبە

لە شۆرین و لە ماڵین و لە ڕادان...
دوکان بۆیان بە ڕادەی سەد جەریبە



دەبێ هەر کار بکەن تا دەچنەوە ماڵ
سەری خۆ قاڵ بکەن، بگرە و بەری بە

هەتا خاتوونی خاوەنکاری دڵڕەق
ببێ ڕازی، بە سەد مەکر و فەریبە

ئەوانەی کار ئەکەن لەم شوێنە ئیشیان،
قەدیم... دوکتۆر و مامۆستا و نەقیبە

لە ئەفغانی و لە فارس و تورک و عارەب
وەلید و ئەکبەر و ناجی و حەبیبە...

دەڵێن: خاوەن دوکان چیمان هەبێ «تیپ»
وەری دەگرێ، لە ژێر ناوی «زەریبە»

بە پارەی کەم، دەکێشین ڕەنجی بێوار
لە بۆ جەلبی ڕەزای، «مادام موسیبە»

لە سەر دۆخی نالەباری کرێکارانی دوکانێکی پیتزایی کە ئافرەتێک خاوەنی بوو.

ڕەزبەری ٢٧١٧ ، ئۆتاوا



# " ڕۆژی ئاوێنە "

کۆنە هاوڕێکەم ، سا خۆت بنوێنە
با یادێ بکەین ، لە " ڕۆی " ئاوێنە

ماوەی سی ساڵە کە من دوورم لێت
بەڵام قەت لە یاد، خاڵی نەبووە جێت

پێم خۆش بوو لێرە، لەم دووروڵاتە
شەن و کەویان کەم چی بەسەرهاتە

تاکوو بژار کەم لە نێو ئەوانە
ئەوەی کە لامان کۆنە قەوانە

حەزم کرد ئاوا چەن بەیتێ دابەم
بەڵکوو تەمی خەم لەو دڵەت لابەم

ئەو دەم کە هێشتا کوڕ بووی، جحێڵ بووی
هێشتا جوانەگا و سەودایی چێڵ بووی



لە بیرتە؟ ڕۆژێ هاتم بۆماڵتان...
تاکوو بزانم وەزع و ئەحواڵتان...

بەڵام لە یەکەم تەوقە و ڕابوونت
زانیم «هەڵدەفڕێ قەلێ لە قوونت»

ئەو ڕۆژە وەکوو تێتدا بێ جیوە
ئارامت نەبوو لە نێو ئەو دیوە

وەها دیار نەبووی کە قەوڵت دابوو
دیار بوو کە «کێچێ لە کەوڵتدا» بوو

لە هەل دەگەڕای کە چۆن بۆی دەرچی
بۆیە دەستت کرد بە هەرچی و پەرچی

فەرمووت بە عادەت ئەمن جاروبار
بە یادی قەدیم، دەچم بۆ حەسار

دیوێکی لێیە زۆر تەڕەشۆیە
تاونەتاو دەچم لە بەر ئەو هۆیە...

کە بیرەوەری منداڵیم لێی هەس
هێندەم پێناچێ، دێمۆ دەمودەس

فەرمووت کە خاڵۆت زوڵمی لێکردووی
بەو هۆدە تەڕە، لە خشتەی بردووی

خۆی لە دیوە خان باڵانشینە
تۆیشی داناوە لەو ژێرزەمینە



هەروەها بیرمە هەمدیسان فەرمووت
کە لە بن لێفە پەنجەم زۆر دەبزووت

لە ماڵۆ پێیان وا بوو نەخۆشم
پەتا و لەرز و یاو بوونە هۆی جۆشم

نەیاندەزانی زامم چەن قووڵە
لە بن لێفەدا، بۆ دەکەم جووڵە

تەنیا هاوڕێی من لەپی دەستم بوو
یاریدەدەری هەوا و هەستم بوو

بە ڕەنگ و ڕوخسار زەرد هەڵگەڕابووی
دەتگوت دوور لە گیان شەپڵە لێی دابووی

لێوت دەلەرزی کاتی فەرمایش
هەروەک لە دووت بن هێزی ئاسایش

هۆشت نەمابوو دەگەڕای بۆ کون
پەنجەت بێئاگا، دەیاندۆشی گون

هێندە ئاڵۆز بووی وتەت دەجووڕان
لە ناکاو قوونت چون مەزرەق سووڕان...

وەک فیشەک دەرچووی میوانت جێهێشت
لەگەڵ دوو کاسە و یەک قابلەمەی چێشت

منیش ماوەیەک چاوەڕوانت بووم
بڕێ دانیشتم، بڕێ هاتم، چووم...

بیرم کردەوە لەو فەرموودانە
لێکم دانەوە، دانە بە دانە

هەر خێرا زانیم گۆڕیوتە تاکتیک
لە بن لێفەوە بۆ دیوی تاریک

جا بۆیە هەستام لە پێم کرد کەوش
بە لەز هاتمە خوار من بەرەو حەوش

گوێم لێبوو کاتێ کە هاتمە حەسار
لەوهۆدە دەهات دەنگی «گارەگار»



یەکەم وام زانی دەنگی مامرە
کە هێلکە دەکا یاوەکوو کرِە

نەمزانی کە تۆی بارِۆکەی قوون رِووت
خۆت حەشار داوە و دەرگات کردوە جووت

---

نەرمەپێ هاتم بەرەو پەنجێرە
بۆوەی بزانم چی قەوما لێرە!

سەیرم کرد کە تۆ لە بەر ئاوێنەی
خەریکی ئیشی دەربێنە و تێنەی

گەلێ هیلاک بووی، هەناسەت سوار بوو
زەنگۆڵەی ئارەق، بە گونتۆ دیار بوو

دەتهێنا و دەتبرد ئەم سەر بۆ ئەو سەر
چووکێکی لاری ئارەقاوی تەرِ

هانەهانت بوو، زۆر بەپەلە بووی
بەرقاڵی ئیشی «بەلەبەلە» بووی

سەرتاپای باڵات لە ئارەق نیشتوو
هێشتا بە کامی دڵت نەگەشتوو...

پاشت وەک دەرکی قەڵا قونجابوو
پێشت لە خانەی لەپ ترنجابوو

هێندەت گلۆفی لارەی بێ پدەر
تا دڵۆپ دڵۆپ ژەکی دایە دەر

لە کۆتاییدا لەرزێکت لێهات
گوڵی ڕازیبوون، پشکووت لە گۆنات

ئەوسا تێفکرام لە فەرموودەی تۆ
کە بۆ ئەو دیوە، هەڵیهێنا شۆ...!



ئیتر تێگەشتم من لەو هۆکارە
کە هۆدەی حەسار، بۆ وا شێدارە

پاشان بۆ ئەوەی نەزانی بە من
تا خەلاست بێ لە سڕینی گون...

خێرا بە دوو باز خۆم گەیاندە سەر
خۆم کرد بە «تووڵبڕ» بێ ئاگا و خەبەر

بسکەی سمێلت دەهات کە هاتی
شوێنەوار نەما لە کزی و ماتی

گووپت تێی زابوو خوێنی ڕەزایەت
دامرکان «لەپ» و «مەچەک» و «خایەت»

نەما لە ڕواڵەت نیشانەی ئازار
گلەیی لە خاڵ، یان هۆدەی شێدار

هەموو ئەمانە تۆپ و تەشەر بوون
بۆ دامرکانی ئاگری بەر بوون

پاش ئەوەی پێش و پاشت حەسانۆ
ئەمجارە هاتی بە لای میوانۆ

منیش ڕامگەیاند کە ئیتر دەڕۆم
گەلێ مەمنوونی میوانداری تۆم!..

زۆرت هەوڵ دا بمێنمەوە چاشت
دەستت پێکردۆ بە گلە و بناشت

کە بۆ نان ناخۆی؟ لەبەرچی دەڕۆی؟
بۆچی ئەوەندە جیڕ و سەرەڕۆی

بەڵام نەتزانی ئەو وێنە گەندە
کوێری کردەوە ئیشتیای بەندە



شیلەی وشکۆبووی ژەکی بن گونت
هێشتا لە بەینی پەنجە و ناخونت

ناو لەپت هێشتا نمی ژەکی بوو
سوێراوی گونت، خوێ و نمەکی بوو

بۆیە جێم هێشتی و بەخشیم خێری شام
لە بەر چاوم کەوت مەزە و چێژ و تام

---

ئەم شیعرەی بەندە نەوەک بۆ پەندە
تەنیا بۆ وەیە تۆ بێیتە خەندە

تکایە نەیگری تۆ لە من بە دڵ
خۆشەویستی تۆ، وشەی کردم کڵ

کە بەم شێوازە بێم و بتدوێنم
چی خەم لە دڵتە هەمووی دەربێنم

پێشکەشت بکەم ئەم شیعرە تەڕە
بۆ میوانداری پێش لەو «دەسپەڕە»

زەحمەتت کێشا، خۆتت زۆر ڕەتان
ئاوپرژێنت کرد، سەرخان و ژێرخان

چەندە پەرۆش بووی!.. یادی بە خێر بێ
بەر و بەراوت،... هەر خێر و بێر بێ

هیوام وەهایە دۆستی کەم وێنە
قەت لە بیر نەکەی، ڕۆژی ئاوێنە

ڕەشەمەی ٢٧١٧ ، ئۆتاوا

# سیمای پاییز

دیمەنی ڕەنگامەی درەخت

تەزی ئۆخەی جێژوان و،

ئامێزی ئازیز

گەڵا و دار و گوڵی ژاکاو

ژوانی زەرد و

ڕووباری زیز

هێژاترین تابلۆی سروشت

ڕەنگدانەوەی بیرەوەری و،

تاسەکانە

سیمای پڕ لە ئەشقی

پاییز

ئۆتاوا - یەکی ڕەزبەری ٢٧١٥



# من باکوورم



من باکوورم
من باکوورم
هێمای سەربەرزی و کۆڵنەدان
شەپۆلی ڤان،
شوورەی بەرخۆدانی سوورم

من باکوورم
من باکوورم
گڕکانی تۆڵەی ئاگری و
ترپەی دڵی شێخ سەعید و
چقڵی چاوی کەواسوورم



من باکوورم
من باکوورم
بورکانی گڕ و ئاهێرم
هاواری ئەشکەوتی دەرسیم
هاژەی فورات،
من پەیامی نووری پاشا و
نرکەی دڵی عەلی شێرم

من باکوورم
من باکوورم
باهۆی ڕۆژاوا و کۆبانیم
کوردستانیم

چاوگەی هیوای ڕۆژهەڵات و
بڕبڕەی پشتی باشوورم
من باکوورم
من باکوورم

بەفرانباری ٢٧١٥

# «من هەژارم»

پێشکەشە بە گیانی ئازا و قەت نەمری شەهید، هەژار بێستوون موحەممەد، پڵەنگە چنگ بە خوێنەکەی گەرمیان، کە تا دواهەناسە لە مەتەریزی شەرەف و بەرخۆدانا، بۆ خاک و سەربەرزی، خوێنی پاکی تێکەڵاوی زنجیری دەبابەی دوژمنانی سەرخۆبوون و سەرفرازی کوردستان بوو. هەزاران سڵاو لە گیانی پاکی!

من هەژارم
من هەژارم
لە تەوێڵما
هێمای پیرۆزی پێشمەرگە و
لە ناسنامەم،
خەڵکی گەرمێنی شۆڕابەی
خوێن و ئەسرین و
ئازارم

من هەژارم
من هەژارم
لەم تەمتەمانی پایزە

لەم سووتمانە...
لەم شەختەبەندی خەزانە



ئومێدی سەرهەڵدانەوە و
بانگەوازی سەرفرازی و
شنۆی نەسیمی بەهارم

من هەژارم
من هەژارم
بڵێسەی ئاگری تۆڵە و
ڕۆحی تووڕەی مامە ڕیشە و
زایەڵەی ژاناوی گەل و
خاکی کەرکووکی زامارم

من هەژارم
من هەژارم
من هاواری بندەستانم
من لاوکم، من پایزەم
من چریکەم
من مەرهەمم، من هەتوانم
من حەیرانی بلاوێنی
داخی ناخی
کوردستانم

من هەژارم
من هەژارم
هیوای ڕزگاری نیشتمان
وەک ئەستێرە

**لە ناو چاوانم، خۆیایە**
**من هەژارم**
**بەڵام**
**نەک تەنیا هەژاری «دایە»**
**بەڵکوو هەژاری قوربانی**
**خاک و یەکسانی و**
**سەربەستی**
**چی مرۆڤە**
**لەم دونیایە**

**من هەژارم**
**هەژارەکەی دوژمنبەزێن**
**هەژاری دەبابەشکێن**
**پارێزەری بە ئەمەگی**
**هەرێمی زام و ژان و، خوێن**





ئەمن تەرمی وڵاتێکی سەربڕاوم
کە بوو بە قۆچ
لە ژێر سمی
چەتەکانی «بەدر» و «حونێن»
من هەژارم
من هەژارم
پلیشاوەی
جەنجەڕی مەزەندەی نەوت و
حیزب و سەرۆکی سەرشۆڕ و
چاوانی سەوزی
دۆلارم

من هەژارم
من هەژارم
شانازی و شەرەفی بەرزی
بەتاڵان و بەهەرزان چووی
گەلێکی دڵ بە ئازارم
ئا لەم دەمەی وەیشوومەدا
کە شەهید و پێشمەرگە و خاک
بەتاڵان ڕۆشت
لە سەنگەری سەرفرازی
من خۆڵم خوارد
بەڵام ئەوان
لە سەر خوانی تاڵان و تاوانی تاران

کورسی کورسی
لەوەڕان و
خاکیان فرۆشت
منیش
لە مەتەرێزی شەرەف و بەرخۆدانا
برسی برسی
ئێسک و پرووسکی خۆم کرۆشت

من هەژارم
من هەژارم
هەژاری دژ بە نائومێدی و
بێزاری
ورەم پۆڵا و
وزەم تینی بابە گوڕگوڕ
من وانەیەکم بۆ دوارۆژ
ئاسمانێکم
سامالْ، لە هیوای ڕزگاری
بنەی پەلتەکی پایزم
لە بەهاردا دەژییێمەوە و
ڕەگ ئەژوێنم
لە ناو هەموو کەرتەکانی
کوردەواری





من هەژارم
من هەژارم
بەڵێن ئەدەم بە کوردستان
بە دڵۆپی
خوێنی ئاڵی شەهیدەکان
بەڵێن بێ دەگەڕێمەوە
پەنجەکانم
هەموو دەکەم
بە گوڵووک و پشکۆی ئاگر
هەناسەم دەکەم بە زریان
چاوم دەکەم بە چلچرا و
دڵ و هەناوم بە گڕکان
بەڵێن بێ، دەگەڕێمەوە
دەبم بە برووسکە و باهۆز
گڕ دەبارێنم بە لێمشت
دەبم بە خەنجەری تۆڵە
ڕۆ دەچم لەو دڵ و ناخەی
کە خوێنی سەرخۆبوونی ڕشت
بەردەبمە
جەستەی ئەوانەی کە هاتن
شەهید و خاک و پێشمەرگە و
ئاڵای پیرۆزی کوردیان
کوشت...

۱۲ی خەزەڵوەری ۲۷۱۷، ئۆتاوا

# نەوە

پاش چاوەڕوانی و عومرێ کەساسی
لەبری بەرهەمی پوخت و ئەساسی
لە جێگە و شوێنی کۆرپەی بەڕاسی
دوو نەوەم هەنە وا دێمە باسی
یەکێکیان سەگە و ئەویتر ماسی

منالْ پێم ئێژن دڵ خۆش کە بەمە
کۆرپەی بەڕاستی هەر دەرد و خەمە
نەوەت بۆ چییە ئا لەم سەردەمە ؟
خۆشمان داماوین لەم ژەم بەو ژەمە
هەموو شت سازە و هەر نەوەت کەمە ؟!!

بە تایبەت ئێستا لەم دۆخە سەختە
«کۆڕۆنا» دەرگای دنیای کرد تەختە



داویە لە باخمان وەک مڵە و شەختە
جیق و فیق دەرهات لەم هەموو زەختە
نەوەی چی ساز کەین ! کوا ئەمە وەختە ؟ !

گەر لێمان گەڕێن بانک و خاوەن ماڵ
مانگێ ئیش نەکەین ، سێ مانگیش بەتاڵ
پڕ بن گیرفان و کیف و یەخەچاڵ
دەماخ چاخ بێت و کۆک بێ ئەحواڵ
بۆتان ڕیز دەکەین بە جەڵە منداڵ

تاکوو ئاسایی دەبێتەوە وەگ
وازمان لێ بێنن تا تەقینی هەگ
ئەرخایەن ببن تا خوێن بێ لە ڕەگ
هەر کە چووینەوە نێو «قاپووری» بەگ
نەوە ساز دەکەین لە بری ماسی و سەگ

ئۆتاوا ، خەزەڵوەری ٢٧٢٠



# پارچەیەك لە ڕامانێ

کام نهێنی
نێژراوە لەم ئەشکەوتەدا !
چی سەرنج ئەدەم ،
تێناگەم
گەلۆ :
لە زاری ئەشکەوتا ...
ئەوینداری ڕاوەستاوە و ،
تاپۆی بێدەنگی دادەڕێ
هەناوی ،
کوورەی ئازارە و
پڕ بە گەرووی
بەستەی دڵتەزێنی کۆچی
برای مێرمنداڵی دەچڕێ
هاوار ... هاوار
چ ژانێکی ناخ هەژێنە
چ ئازارێکی بەسۆیە :
برای باڵابەرز و
شیرین و چاوڕەشم
هەسارەکەی

ئاسۆگی دوارۆژی گەشم

چۆن ناخت بەو کۆچە ڕاهات !!

چۆن بوو

بەژنی زراو چەمی !!

چۆن بوو سەوڵی باڵا ،

داهات !!

هاوار ... هاوار

چۆن ئەو دڵەت

کە سەرچاوەی ژین و مان بوو

کە ، لێپاولێپی ژیان بوو

دڵی هێنا ،

جێمان بێڵێ

وا ، قرچەی هەناوە و جخار

پرسیارە لە دووی پرسیار ...

خۆشەویستم

چۆن بڕوا کەم

گوڵی هەموو خۆزگەکانت

بوونە ژەمەنی چەقەڵ و

گورگ و ڕێوی و

پیرە کەمتیار ..؟؟!!

ئۆتاوا

بۆ چوار خوشک و دایکێکی چاوەڕوان



# پارێز

دەڕوا وەک دەڵەک بەردەدا وانێک
ناهێڵێ ساتێ بگرین وچانێک

سیانید چییە، فۆسفۆر کامەیە ؟
هەرچی بۆی گەندە، لەلای ئەمەیە

عەتر و عەبیری پاشەڵی وایە
بەسەد **کوولەر**یش هەر چاری نایە

**هەڵەبجە** چییە و **هیرۆشیما** چەس
چەکی کۆکوژی هەر ئەمەیە و بەس

مووی سەرمان هەموو ڕژایەخوارێ
یارەب ئاگر لەو قوونەت بباریٌ

کە ئەو بەری دا، با، بە بێباکی
سەد خۆزگەمان خواست بە ﴿**ناکازاکی**﴾

لام وایە کۆڕێ پسپۆڕ بهێنن
گازی پیتاو لەو کونە دەربێنن

بە تێر و تەسەل لێکۆڵن لەمە
بزانن چییە ئەم مژ و تەمە،



مەشهووری عامە تڕی ﴿ نیکۆڵاس ﴾
حەوت قۆناخ دوور بی دەتکا وڕ و کاس

باکسمان لێدەدا لە کاتی بەربانگ
لەپڕ شاتێکی بەردا وەک ﴿ سکانگ ﴾

تەنگەنەفەس بووم، خەریک بوو بمرم
هەڵاتمە حەسار هەوای نوێ بگرم

سینگم توند بووبوو، کۆکەکۆکم بوو
هاواری سینە و ئەژنۆ و چۆکم بوو

هەی ماڵی قوونت بەقوڕ بگیرێ
یارەب لە پاشت ڕۆبچێ تیرێ

خۆ کاست کردین، لە سەر خۆمان چووین
لە تاوی کوورەت تووشی باپۆڕ بووین

لێمان پرسی هۆی ئەم ئاڵۆزبوونە
فەرمووی: ئەم بۆنە، خەتای سەموونە

نابێ بخۆم من نانی سپی و سۆڵ
دەبێ خۆ بگرم لە فایبر و پرپۆڵ

﴿پارێز﴾ ئاوەها قوونی شل کردووم
ئابڕووی چەند ساڵەی لای ئێوە بردووم

دوکان - ٢٨ / ٠١ / ٢٠٠٨ ئۆتاوا

# پاشاگەردانی

مەیکەن بە پاشاگەردانی
ئەوەی ئێوە گازی دەکەن
لە بانی هێلکەی وەنەوزە وردەکانی
نیشت و
پووچەڵ trووکانی
ئەمجارەیان
لە جێی سەفەر بۆ باشوور و
«سلێمانی» ،
نەوەکانی «ئەبووتالیب»
بوون بە پاڵەوانی شیعر و
چامە و قەسیدە و
ڕۆمانی
ئێستاش تکاتان لێدەکەم
ئێوە و باوکی و شیعرەکانی ..



**سەر لە «کاوە» مەشێوێنن**

**خۆڵ مەکەنە چاوەکانی .**

**کوردستان هەمووی ڕووگەیە**

**دە لێیٚ گەڕێن**

**با خۆی بڕیار بدات بەرەو کام دەڤەر بێ**

**گاڤی نەرمی**

**خەونەکانی ...**

**ئۆتاوا ، ٧ی بەفرانباری ٢٧١٧**

لە سەر هەڵوێستە شیعری کۆمەڵێ کە داوایان لە جەلال مەلەکشا کردبوو، نەهێڵێ کاوەی کوڕی بچێ بۆ سلێمانی چونکە دەسەڵاتی سلێمانی لە **٢٠١٧** کەرکووکیان داوە بە دەست ئیران و حەشدی شەعبی‌یەوە!





# پاشەڵ و کورسی

ئەوەی دوێنێ بریکار بوو لە برسی

شێری دەنواند، نەبوو لە مردن ترسی

هەر کە دەرگای ڕاژۆری لێکراوە

بای پاشەڵی دەرچوو بە سیحری کورسی

ئۆتاوا، گەلاوێژی ٢٧١٨

# خۆزگە

خۆزگە شنەی شنۆی بەیان، بۆنێکی تۆی بۆ ئەهێنام

خۆزگە کە چاوم هەڵدێنا، بەژنی تۆم دیبا لە پەنام

سەد خۆزگە شەونمی پەلکی گوڵاڵەی سووری گۆنای تۆ

پەڵەی بدایەت بە لێزمە، لە سەر دەشتی تینووی نیگام

ئۆتاوا ٢٠١٣





# پەنجەی هونەر

هەر ژەم و چەشنە هونەریٚ پیٚدەگا

بەرهەمی جوانتر لە بەریٚ ، پیٚدەگا

پڕ لە گوڵن دەفتەر و دیوانی من

( هەر دەمیٚ لەم باخە بەریٚ پیٚدەگا )

ناسک و خەمڵاوە بە پەنجەی هونەر

هەر چی لە «زاهید» ئەسەریٚ پیٚدەگا

پەسنی وی ناگونجیٚ لە دیٚڕ و دوان

هەر چی بڵیٚم ، هەر زەرەریٚ پیٚدەگا

ئۆتاوا ، گوڵانی ٢٧٢٠

بۆ : کاک زاهید ساڵحی



# پەرجۆی پاییز



کە پاییزە...
پەرجۆی ساڵە
سەیری هەرچی دەکەم
زەردە
ئاڵتوونییە،
کەسکە
کاڵە
گەڵا و گیا
سارا و چیا
هەموو زەرپۆش
ئاڵ و واڵە

کە پاییزە...
چی دیمەنی شۆخ و شەنگە
هەر چی جوانی و،
نەخش و ڕەنگە
لە بازنەی وەرزی ژاکان و
لە ملوانکەی سروشت ڕیزە

که پایزه...
خۆشترین خەم،
که ئامۆی ساڵانی دووره،
میوانمه
خەمێ چما،
زەردەپەڕی دوایین ژوان و
ماچی تاڵی ماڵئاوایی و
دوایین دیداری
ئازیزه

که پایزه...
ڕەز له شەخته و گوڵ
له سەمای مەرگی گەڵا و
له کۆچی ڕەنگاڵه
زیزه
خەزەڵ،
فەرشی ڕەنگامەی ڕێ و
خەزان،
بانگەوازی شانۆی
پەرجۆی ساڵه
که پایزه...

ئۆتاوا، پایزی ٢٧١٨

# پێشمەرگە

سەرۆکەکان و
حیزبەکان
پاشکۆکان و
سەر و ژێر و لاکردەکان
ئاگادار بن..

ئەوەی ئێوە
لە گۆڕەپانی حەزە سەوز و زەردەکان
دەیبزوێنن
مۆرە نین
بەڵکوو مرۆڤن

چ ڕازێکە و
چۆنە ئێوە
لە کێبڕکێی مەرگی گوڵا
وا بەپەلەن؟!
بۆچی دڵتان
ئەو ژانە لە خۆ ناگرێ؟!



ئەو ئازارە تێناگەن و
وەک ماری سڕ
هێشتا هەر لەو،
کراژ و کەلەن!..
لە بیرتان بێ
ئەوەی پشتی ئێوەی گرت و
پاشی ئێوەی نا سەر کورسی
ڕۆڵەی ئەم خاکە بێنازە و،
چرای ڕووناکی ئەم هەلەن
بەڵام ئێوە
دەیانکەن بە پووش و سووتە
بۆ ئاگری
حەزی خۆتان
ئەوانەی وا
داهاتووی ئەم کوردستانە و،
سامان و
توێشووی ئەم چەلەن

ئەوەی ئێوە
کێبڕکێتانە بۆ مەرگی
«پێشمەرگەن»
ژیانن

گیانن
خولیا و ئەشقی
نیشتمانن
ئاسۆی ئاواتی «خۆبوون» و
گلێنەی
چاوی ئەم گەلەن

ئۆتاوا، گەلاوێژی ٢٧١٨

بۆ پێشمەرگە، بۆ گوڵی ئەو گیانە پاکانە کە لە پێناوی کێبڕکێ و دەستەوەستانی سەرۆکەکان و بنۆکەکاندا هەڵدەوەرێن.

# پەڕەی شەست و چوار

وا دیسان وەری گەڵای پیرەدار
هەڵدرایەوە پەڕەی شەست و چوار
ناڕوونە ئاسۆی خەونی چەن ساڵەم
نادیارە کۆچ و ڕێوار و هەوار...

ئۆتاوا، ١٧ی ڕەشەمەی ٢٧١٧
بە بۆنەی دەسپێکی ٦٤ ساڵی تەمەنم



# پند

ما گرفتیم و بسی دیر درآمد پندت
جان فدای خندت
شعر ایرج همه زیبد که برآید تنها
از لب چون قندت

گوش از کار بیفتاد و همه دیده شدم
زار و ژولیده شدم
میرزا نیز فراموش کند پند اگر
بیند آن لبخندت
شهد ریزد ز لبت چونکه به صحبت آیی
آنقدر زیبایی
هر کسی بیندت آن پند به کارش ناید
چون شود پابندت

الغرض ایرج اگر دیده بدی سیب و سبد
بی گمان تا به ابد
پند و اندرز فراموش بکردی و شدی
شاعر دربندت

اتاوا ، پاییز ۱۳۹۹

اندر باب شعر خوانی زیبایی از شمال ایران




له لێزانی و له ژیری و سەرفرازی

له دڵسۆزی وڵات و «گەلنەوازی»

هەزاران سوورِی دی پێویستە گەردوون

كه بەرهەم بێ، مرۆڤێ چەشنی «قازی»

ئۆتاوا، خاكەلێوەی ٢٧١٨



# پەسنی مامۆستا نامۆ
# بۆ شیعری یەلدای من



هەتاکوو عەتری هەستی تۆ لە من بێ

بدەم شــەرتە گوڵی شــیعرت لە ئێخەم

فاتێح موحەممەدی - نامۆ

# وەڵامی من بۆ مامۆستا نامۆ



بە سۆزەی پەســنی هۆنراوەت لە سەر چەم

ڕەوی گــەرد و تــەپ و تــۆز و مــژ و تــەم

بــە هیوامــە دڵــی شاد و بزە و گــوڵ

لە خوانی شــەوچەرەت کــۆ بن، دەم و ژەم

یەلدای ٢٧١٧، ئۆتاوا



# پڕی پڕم

ئەوەندە بێزارم لە ژین...
هێندە پڕم لە برک و قین...
شوێن نەماوە لە ناخمدا...
شوێن نەماوە لە ناخمدا،
بۆ شیعر و،
چامەی ئاگرین
بۆ بەستەی پەسنی بەژنی شۆخ
شوێن نەماوە لە ناخمدا
بۆ سیحری نیگای مەستی تۆخ
بۆ گوڵووکی چرۆی لێو و،
بۆ دەریای مەندی،
چاوی شین
چیتر،
وشەم پێ نەماوە
بۆ دڵداری و،
بۆ ژوان و،
بۆ خۆشەویستی و،
بۆ ئەوین
پڕی پڕم
لە ئاهی سەرد





پڕی پڕم
لە زام و دەرد
پڕی پڕم
لە گورپ و ژان
ئامان...
ئامان...

کوورەی ژاراوە دەروونم
چۆڕاوەی ناراوە هوونم
گەلێ بێزارم لە بوونم
گەلێ بێزارم لە بوونم
لە خۆم و،
لە ( ناخۆ ) بوونم
لە گەردەلوولی دەوروبەر
لە پەڵە و،
تاوی بارانی
درۆی بەشەر
لە داچوون و،
لە ڕۆچوون و،
لە



ڕمان و،
ئاوا بوونم...
پڕ بێزارم...
پڕ بێزارم
لە ئاوازی دەهۆڵی شەڕ
لە سروودی،
قەڵاچۆی تۆرەمەی ئێنسان
لە هەڕاجی شعوور و،
لە مەرگی ویژدان
لە مرۆڤی هەزار دیمە و،
هەزار ڕووبەر
لە مەودای دووری وتە و دڵ
لە دار و بەرد و،
ئاو و گڵ
لە زەمین و،
لە زەمان و،
لە ئاسمان...
لە ناتۆرە و
زامی وشە و،
تاڵاوی،
نەشتەری زمان
ناخم پڕە...
ناخم پڕە
لە بەستەی شین
پڕم لە زایەڵەی گرین



ئامان...

ئامان...

گوێم خنراوە

لە وتاری ڕەنگاوڕەنگی،

خامەی تاوان

لە ئاهەنگی

سەمای دهۆ و،

لە مێلۆدی،

درۆی ژیان...

وا دوومانە و،

قرچەی جەرگ...

وا دوومانە و،

قرچەی جەرگ

پەیتا پەیتا،

بە سەر پانتایی جیهانا

شەڕ دەبارێ،

وەکوو تەرگ

چاوەڕوانم...

چاوەڕوانم،

دەستم بە داوێنت

مەرگ...

با ڕزگار بم

لە زیندان و پاوان و کۆت

سۆما،
تاراوە لە دیدەم
هێندە چاوم گێڕاوە بۆت
لە کوێی؟!...
لە کوێی؟!...
لە کوێی هەتا
بێیت و،
بمبەیتەوە بۆ خۆت...
لە کوێی هەتا
بێیت و،
بمبەیتەوە
بۆ...
خۆت...

بەهاری ٢٧١٨ ، ئۆتاوا

# قەرزی ماچ

ئەگەر بێت و لە کوڵم و لێوی جوانی
دزیبێتت لە هەر کام، ماچ و دوانی
بە تەنیا قەرزی ماچە بێ سەروژێر
کە داواشی بکەن هەر تۆ دەکەی خێر

گەلاوێژی ٢٧١٨، ئۆتاوا



# قولاپی دووچز

لە سەر لێو پشکووت سەد گوڵی بزە
کاتێ هەواڵ هات لەو لای سەقزە
«**گۆران**» ی برازام ئەو ئیمانسزە
بە تیرێ خاوەن دوو کارمامزە
دیارە قولاپی ئاغا دووچزە

هێندەی بیرم بێ تا ئەم سەردەمە
لە هۆزی ئێمە پیاوی وا کەمە
بێجگە لەم زاتە کە بە بێ گەمە
بەری یەک تەقەی دوو دانە «**قز**»ە
دیارە قولاپی ئاغا دووچزە

چەکی ئەم کەڵە چما تایبەتە
هەرچی بپێکێ ، حەتمەن دوو لەتە
چون ئا بەو مل و شان و شەوکەتە
هەر دەڵێی میری «**سەرا**» و «**مەرخوز**»ە
دیارە قولاپی ئاغا دووچزە

هیوام وەهایە بەو تین و تاوە
بێتە بەرژەنگی چی گەنج و لاوە
چونکە بە کردە نیشانی داوە
چەن بەرزە تێیدا باوەڕ و وزە
دیارە قولاپی ئاغا دووچزە

بەڵام ئەم پرسەش هەر لەلام ماوە
«زوڵفە»ی برازام ، ئەم دژەباوە
ئەو تاس و نەردەی لە کوێ هێناوە
کە جووتی هێنا بی فێڵ و گزە
دیارە قولاپی ئاغا دووچزە

ئەمن وەک مامی سەرم پێی بەرزە
دوو پیرۆزباییم وا لە سەر فەرزە
پێشکەشی بکەم بەو شێرە شەرزە
بۆوەی حەوای دا ئەم شانە کزە
دیارە قولاپی ئاغا دووچزە

**ئۆتاوا ، شەوی ٣٠ ژانڤیەی ٢٠١٧**

بۆ «گۆران»ی برازام بە بۆنەی لە دایکبوونی دوو کچە جوانەکانی کە لفەودوانەن.

زوڵفە: کورتکراوەی زوڵفەقار ( شمشێری دوو فلیقانە )، کە کردوومەتە نازناوی گۆران لەم شیعرەدا.





# قووەی جازبە

ژنەفتم دووروا ماشین لێداگە
شان و گەردنی تواو کوتیاگە

تەرەف تورمزی گوویا بڕیاگە
هەواسی نەوگە و خوەی پیا کێشاگە

بیلافاسڵە جەمە بریاگە
بۆ بیمارسان و فەحس کریاگە

پانزە ئازمایش لە ڕووی دریاگە
نەتیجە بۆ لای دوکتور بریاگە



دوکتور وتگەسی: کە ئەو پیاگە
تورمزی جەرگ و دڵی بڕیاگە

نەتیجە تەحوێڵ پۆلیس دریاگە
پۆلیسیش سەری تواو شێویاگە

ئینشوڕانس هەرچی کتێو گەڕیاگە
بۆی پەیا نەوگە، چەپکا لەو یاگە

ئاخرین تەحقیق نیشانی داگە
کە هیچ گوناحی نەوگە ئەو پیاگە

هەرچەن پای لەبان پیداڵ دانیاگە
قووەی جازبە ئەوی کێشاگە

چەیسی کردگە و بۆی نەوێساگە
ناچار چەن پۆینتی لە بان دانیاگە

١٤ ی بانەمەڕی ٢٧٠٨، ئۆتاوا - کانادا



# ڕۆژەڤ

کات ،
لە ڕەوتی وردی خۆیدا
ئارام ئارام
ئاکاری مرۆڤ دەگۆڕێ و ،
وێنەی تەواو دەشەمزێنێ
کەچی تاسەی
چاوی بیری پیری ئێمە
هەر ،
وێنەی جاران دەنوێنێ
گران بەڵام ئەو دەمەیە
گوڵخەونەکان دەژاکێن و
تاپۆی خۆزگە لادەدرێن و
ڕۆژەڤ ،
لە ژوانی ئاوێنە
چاوی خەواڵوو ،
دەدوێنێ ...

ئۆتاوا ، ڕیبەندانی ٢٧١٩

# پێشەکی « ڕاو »

هۆنراوەی «ڕاو»ی مێهدی ئەخەوان سالێسم دەست کەوت و زۆرم بەدڵ بوو. ماوەیەک بیرم لێکردەوە کە وەریگێڕمە سەر زمانی کوردی و لە ئاکامدا ئەو کارەم وەئەستۆ گرت.

هەوڵم داوە شێوازی هۆنراوەکە کە خۆراسانییە، نەگۆڕدرێ و هەروەها لە سەرهەمان کێشیش بڕوات.

ئەم هۆنراوە بە هۆیەکی نادیار، زۆر نزیکایەتی هەیە لە دەروونی من. هەروەها، کە خوێندمەوە، هەستێکی سەیرم تێدا درووست بوو وا کە فرەتر، ئەو هەستە هانی دام بۆ وەرگێڕانی.

ڕەنگە خۆشەویستی و ڕێزی فراوانی من بۆ سروشت و دژایەتی لەگەڵ ڕاو و ڕاوچی، هەمان هۆکار بێت کە منی هاندا بۆ وەرگێڕانی ئەم هۆنراوە و بەتایبەت سەرنجی ڕاکێشام بەرەو ئاکامە تراژیدیاکەی.

لە کاتێکدا کە ئا لەم دنیادا، ڕۆژی ملوێنان بوونەوەر دەبن بە قوربانی بۆ ویستی مرۆڤ، لە هەمان کاتیشدا، کەسانی واهەن کە داکەوتنی تاکە گەڵایەک لە سەر درەختێ، تەواو دەیانهەژێنێ.

ئەم دژایەتییە، وێڕای ئەوەی کە سەرسووڕهێنەرە، لە هەمان کاتیشدا، هەموو هێڵەکانی ئاکار و ئەخلاقی لە مرۆڤدا، بەزاندووە و بە گشتی هانی داوە لە پێناوی ئامانجەکانی خۆیدا، هەموو شتێک

بکات بە قوربان و قوربانی. ئەمەش نەک بەو واتایە کە مرۆڤ، بێتاوانە بەڵکوو بە پێچەوانە، مرۆڤ تاوانکاری سەرەکییە چون، خاوەن هزرە و دەتوانێ بیر بکاتەوە و لە سەر بیرکردنەوەکانی ڕا وەربگرێ.

لە کۆتاییدا، داوام لە خوێنەرانی بەڕێزیش ئەوەیە کە هەر چەشنە پێشنیار و ڕەخنەیان هەیە لە سەر ئەم وەرگێڕانە، ئاگادارم بفەرموون. بە دڵنیاییەوە، بە سینگێکی فراوانەوە وەریدەگرم و هەوڵ دەدەم کە هەموو ئەوانە لە بەر چاو بگرم. شایانی باسە کە ئەم هۆنراوە لە کتێبی زمستان ی ئەخەوان دا هەیە و بە بڕوای من لە باری شێواز و ناوەرۆکیش، دەتوانم بڵێم یەکێک لە شاکارەکانی ئەخەوانە.

بەو هیوایە، ئەم کارە شیاوی ئەوە بێت کە شوێنێکی بچووک لە نێو کتێبخانەی کوردیدا بۆ خۆی بکاتەوە.

سەقز - ١٣٦٤ی هەتاوی





# ڕاو

بەیان دەرکەوت بە دیمەنێکی مەیلەوتاڵ
پیرە ڕاوچی، خەزێنەی ئەزموونی کۆنساڵ
بە خەنجەر و تفەنگی شان و کۆڵی پشت
ڕوو نەشۆراو بە نیازی ڕاو دەرچوو لە ماڵ

جەنگەڵ هێشتا لە نێو دەرگووشی بەیانا
لە خەودایە و سینگی پریاسکەی ڕازانە
بەڵام بەیان ئەنگێوەکانی دارستان
بە چریکەیان هەواڵ ئەدەن: وا بەیانە

تا دڕندە و مەلانی شاری سەوزەپۆش
لە مەستی خەو، چاوی خەواڵوو هەڵبێنن
وەک ڕۆژانی بەرێ کوانووی شارەکەیان
بە پشکۆی ئاگری ژیان داگیرسێنن

دیسان پڕ بوو لە باوێشک و گرمە و هەرا
خەونی گران لە چاوی دارستان تارا
پیرەڕاوچی خۆی و تفەنگی سەرشانی
هاوکات، تێپەڕی بە پاگەی لێڕەوارا

لەو شوێنەی کە باڵای تاڤگە چەشنی نەینۆک
نوێنگەی شەو و ڕۆژ و شاخ و دارستانە ،
کێوێک سەری ناوەتە سەر سەرینی هەور
هەوریش جوانی و شکۆی داوە بەو کوێستانە

ڕاوچی:

ئای دەستم سڕ بوو، لەشت بۆ وا تەزیوە ؟
نەکا بڵێی زەمهەریرم چاوێنـەیە !
دیارە ئەمن پیرم بێ تین و تاو و گوڕ
بەڵام ژەهری تەزیوی تۆش بێوێنەیە

جیرانی مێژینەم، تاڤگەی چیاوی سارد
ئەمڕۆش بیرۆکەی ڕاوێکم لە سەردایە

نەخۆشەکەم چاوەڕوانی گەڕانەوەم
وا لە نوێنندایە و بڕستی لێ بڕایە

ئێستا نێچیرەکەم بزنەکێوی ساوا
لە ژێر سێبەری داربەڕوو، ڕاکشاوە
شاخەکانی وێنەی دوو لقی بێ گەڵا
بە شکۆوە سەر و ملیان لێ هەڵداوە

چاوی ڕەش و بزەی گەشی شاد و وریا
پەڕاوپەڕی چۆڵایی دارستان ئەدڕێ
تاونەتاوێ سەرنجێ، ئاوڕێ، بەڵام
نیگای دیسان لە دیمەنی دڵخواز ئەبڕێ

نیوەڕۆژێک یاری لەگەڵ هاوڕێیانی
لە هەر شوێنێ دڵخواز لەوەڕێ، تێر بوونێ
کاتی نیوەڕۆ تینووتر لە شۆرەکات
بە ڕەوتی جوان بەرەو ناو دۆڵی کپ چوونێ



لەو شوێنەی کە باڵات بەرەو بناری کێو

ڕازێنەری چیمەنی سەوزی بن شیوە،

خوڕەی کەفی زێوینت بە دیمەنێ جوان

پڕ لە شەپۆل سینگی دەشتی دادڕیوە،

نێچیرەکەم دێ هەناوی گەرم و بەتین

منیش لە نێو حەشارگەیەک لە پووش و هەڕگ

هێندە کە تێراو دەبێت و سەر هەڵدێنێ

ویزەی گوللەم بە گوێیدا ئەچرپێنێ: مەرگ

هاوڕێیانی هەڵدێن وێنەی با گورج و گۆڵ

بەڵام سەمای مەرگ ئەکا نێچیری کلۆڵ

لە قووڵایی شیوا کە پەستووی جەنگەڵە

بێدەنگی زاڵ ئەبێ لە دۆڵی سارد و چۆڵ

پاش ماوەیەک دیسان هەرا و گرمە و چریکە

وەک ئەوەی کە ڕووداوی وا ڕووی نەدابێ

پیرەدارستانی پرچ سەوزیش وێدەچێ،
گوێی لە ئاستی ناڵەی کۆرپەیدا، خنرابێ

کاتێ زەردەپەڕە و وڵات هێشتا ڕوونە
ڕێ دەکەوم شەکەت و هەناسە بڕیو
لەگەڵ لاشەی بزنەکێوی ساوای شانم
نەشۆراو دەیخەمە بەر پێت تاڤگەی تەزیو

ورد ورد بە مرواری زوڵاڵ و ڕوونی تۆ
لەشی لە ژێر و ژوور خاوێن ئەکەم تەواو
دەیشۆمەوە هەر وەکوو دیوتە هەزار جار
چەشتووتە لە دەستم تامی هەزار خوێناو

خوێنی شین و کەوە لە گورگی کۆنەساڵ
خوێنی زوڵاڵی جوانە پڵەنگی ناسک
خوێنی ڕەشی گۆڕی کز و لاواز و گەڕ
خوێنی ڕوونی تەرمی نەرمی گەرمی ئاسک



جیرانی مێژینەم تاڤگەی چیاوی سارد

هەتا لە گەشتی ئەمڕۆم ئەگەڕێمەوە

بە تاو بڵێ بۆ هیچ لایێ دی نەڕوانێ

بزەی گەرمی، لە ڕوخسارت نەدزێتەوە

بەڵکوو تین و تاوی، لەشت داگرێنێ

ئەی تاڤگەی سارد من ئیتر توانام نەماوە

جەنگەڵ بۆ ئاسانەی پاییز هەنگاو دەنێ

لەشی منیش لە ڕۆخی گۆڕا وەستاوە

لە دوایین ڕاوم، ئەی تاڤگەی بەژن زێوین

ئەو مێ کەروێشکەی وا دڵی سفت و سۆڵ بوو

مانگ و نیوێ تێپەڕ بووە، وە بیرت دێ؟

ئاوی ئەوجاریشت چاییگ، وەک سەهۆڵ بوو

ئیتر مەودای ڕاو و سەفەری لێ سەندم

کوڕی چالاکم، ڕۆڵەی بێ حەسانەوە

ئەو ڕۆژەش داخەکەم لە ئیشی بەجێما

من و نێچیری بەرەو ماڵ گەڕانەوە

***

پیرە ڕاوچی نوقمی خەیاڵی ڕەنگاوڕەنگ

سەرقاڵی شۆردنی سەر و ڕوومەت و زار

ئاو لە لێواری سمێڵی نم نم دەتکا

تک تک لە ژێر کەڵپۆس و ڕیش ئەهاتە خوار

تەڕی کرد گوێ و پەناملی وێنەی دەستنوێژ

بە دەستی چەپ پڕ بالووکە و چین و ڕۆژە

ڕازاوە بە خشڵ، ئەنگوستیلەی قامک

ئەڵقەی تەلی ساکار و نقێم، پیرۆزە

دەست و ڕوومەتی دەشۆرد و هەزار دەرگای،

لێ ئاواڵە دەبوون لە یادەکانی دوور

تاڤگەش جیرانی مێژینەی ڕاوکەری پیر

شنەی بەژنی خۆیا بوو وەک ئاڵای بلوور



نەرم و نم نم لە هەوری تاڵی نیوەشەو
گۆنای تەڕی جەنگەڵ چڕی دڵۆپی نوور
لە خۆشی دەست بە سەر هێنانی تاوی زێڕ
پڕ بوو لەشی لە شادمانی بێ سنوور

لە چەشنی خەرمانێ پڕ لە بڵێسەی سەوز
چەن دەماری زەرد لە قەراخی ئاڵابوو
لە دیمەنی بەهارانەی ئەم تابلۆدا
جارنەجارێ دیمەی پاییز خۆیا ئەبوو

لە نێو دنیای مەندی ڕووداوەکانی زوو
ڕاوچی نوقمی بیر و خەیاڵ ڕێگای ئەبڕی
هەر هەنگاوێک لە کووچەکانی ئەم شارە
یادێکی کۆن، تۆزی سەر ڕوومەتی ئەسڕی

هاتە پێش چاوی پڵەنگێ لەو شوێنەدا
هێرشی بۆ سەری هاوڕێکەی بردبوو

هەر چەند بێ هەڵە مێشکی پڵەنگی پژاند
بەڵام بە داخەوە هاوڕێکەی مردبوو

لێرەدا گەییبوو بە دارشکێنێ لاو
هاوکات لە گەڵ ماندوو نەبینی دارشکێن
تەڵزمێ بە فڕکە دەرچوو لە چنگی تەور
ناو چاوانی پیرە ڕاوچی نەخشاند بە خوێن

پاشان گەییبوو بەو دڵۆپە خوێنانە
بەدوای ئەو شوێنەدا، توولە ڕێگایەک بوو
کە نیشانەی مەرگی لە سەر بەفرا دیبوو
لەگەڵ چەن جێگە پێ، کە دوورۆ کەوتبوو

لێرە نەبوو داوی بۆ نێچیر دانابوو؟!
بە ئاستەم و هێدی ئەڕۆیی و ڕێی ئەبڕی!
لە پڕ کەوتە چاڵاوێک و هاواری کرد
بەڵام نێچیر بیستی و وەکوو مەلێ، فڕی

***



نیوەڕۆیە ، دۆڵ و شیو گەرماژۆی هەتاو

نوقمی خۆشی و ڕووناک و دڵڕفێن و گەش

وێنەی کۆڵانێکی هەراوی پڕ بەهار

لە شارێکی سەوزەپۆشا بێ خۆل و هەش

کۆمەڵێ ڕێبوار لەم کۆڵانە گەورەدا

لە نێو بەرگی سەوزی خۆیاندا ڕاوەستاو

وەک ئەوەی بانگەوازی جێژن کرابێ

خێڵی ڕێبواری سەوزی گوێگر، قەتیسماو

هەسێڵەکەی پڵەنگ و ئاسک و گوڕ و مەڕ

لە بن شیوا لەشی بڵاو کردۆتەوە

لە چیمەنی لێواری، بزنەکێویەکان

ئاگادار نین، چییان بەسەردا دێتەوە

تێر و تەسەل لە سەر چیمەنی دەشتی سەوز

بە ڕەوتی جوان لە ژێر گزنگی خۆرەتاو

بە ئارەزوو ڕادەبوێرن بەڵام تاوتاو
تینوویەتی، دەیانڕفێنێ بەرەو ئاو

لەوبەر ڕووبار، لە نێو حەشارگەی نادیار
ڕەبەتی پیرەڕاوچییە و تفەنگی دەست
چاوی تفەنگ هەواڵبەری مەرگێ لەپڕ
چاوەڕوانە بەرهەم بێنێ بەری مەبەست

ڕاوچی:

ئاکامی ئەزموونی هەشتا ساڵ، وا دەبێ!
تفەنگی بێ فیشەک؟ ڕەببی لەناو بچی
ئای ئەگەر خوا نەخواستە دەرچی بە هەڵە
ئەم ئاخر فیشەکەت؟.. هاواری کرد ڕاوچی...

نە خورپەخورپی دڵ، نە دەستم دەلەرزێ
هێشتا هەڵەی پێکان لە من ڕووی نەداوە
فیشەکدان بەتاڵ و هەر تاقە فیشەکێک!...
ئەی کوا هەشتا ساڵ ئەزموونم، ڕووی گەشاوە



ڕاوچی:

ئەوا دەرکەوت و هات بزنە کێوی دڵخواز

شریخەیەک هەستا و لە پڕ تیرێ دەرچوو

پێش لەوەی گوێی نێچیر بزرنگێنێ، فیشەک

لە سەر شانی نیشت و بە پاڵیدا ڕۆچوو

هاوڕێکانی بە پەلەپەل هەر وەکوو با

هەر کام بە گورجی ڕێگەیەکیان هەڵبژارد

تاوێ بێدەنگی کەوتە ناو شیو و دیسان

هەر گیاندارێک، سەری بە ئیشی خۆی سپارد

نێچیری ئەنگاوتەی خوێناوی، شەلەشەل

ون بوو لە نێو دارستانی چڕ و پڕدار

لە دوویەوە گرتوویە شوێنەواری خوێن

پیرە ڕاوچی چەشنی گورگێکی بریندار

ڕاوچی:

پێکام، بەڵام بە داخەوە نەک گورچووبڕ

خەمی ناوێ، هەر ماڵی خۆمە و دێتە دەس

ڕووی کردە نێچیری بە فڕکە و بۆڵەبۆڵ
پیرە ڕاوچی، تووڕە و بێ ئارام و وەڕەس

باش ئەزانم کە ئاکـامی لەناوچـوونە
مەخابن کوا گەنجیم؟ بە کوێدا هەڵدێرا؟!
مەلی جوانیم بۆ کوێ باڵی گرت و فڕی؟!..
تاکوو بە دوو هەنگاو بیگرم گورج و خێرا

گرتی شوێنی خوێنی تازەی نێچیرەکەی
بە فڕکە هەڵدەهات و خورپەخورپی دڵ
بە کۆڵەپشت و خەنجەر و تفەنگەوە
خۆی دەکێشا بەرەو نێچیری پڕ بە دڵ

ڕاوچی:

ها... زۆر چاکە، بە بزەیەک گەشایەوە
پشکووت ڕوومەتی بە خوێنی شادمانی
بەڵام لاقی لە بەردێ گیری کرد و کەوت
خەندەی لێوی کۆ کردەوە، کۆکەکانی



ها... زۆر چاکە وا لە سەر ڕێم، وا لە سەر ڕێم

ئەم ڕێگە ڕاست ئەیبا بەرەو قووڵایی شیو

بڵێی لە ناوڕێدا لەناو بچیٚ؟ بەڵام،

بریا کەوتایەتە بەرپێی تاڤگەی تەزیو

کۆڵەباری منە ، بەڵام ئەو هەڵگرە

هەرچەن، چارەڕەش باری خۆی ناوە لە پشت

خۆزیا بڕیٚ هێدی ئاوێتەی مەرگ ئەبوو

تا کوو بەری ڕەنجم ساکار بگرم لە مشت

دەبیٚ زووتر هەڵێم و، تاوی دایە کۆڵ

چەکی بیٚ فیشەک و کۆڵەباری جێما

فیشەکدانم با بەتاڵ بیٚ، خەنجەری مشت...

بە پشتیوانی ئەو، چی نایێتە ڕێما

پڕ کۆسپ و کەند و دوور، نیوە ڕۆژیٚ ڕێگا

وێنەی تۆمار لە بەر پێیدا کرایەوە

تۆمارێ کۆن کە دێڕێکی سووری تازە

بەسەرهاتێکی نووسیوە بەلایەوە

تۆمارێ کۆن کە چەشنی ئەم سەرهاتانە،

گەلێ جاران لە سەر سینگیدا نووسراوە

چەن ڕاوی بێ بەخت و چەن ڕاوچی بەختیار

هەر کام بە وێنەیەک لە ڕوویدا، نەخشاوە

چەن شوێنەپێی تازە کە وا سڕیویەتی

بێ گوێپێدان بە خۆڵ و بە هەژگ و گەڵا

چەن ڕێبواری بێدەنگ کە دیویە سرک و گورج

چەن ڕێواری هیلاک و ترساو لە بەڵا،

ئێستا چ باکێکی لە پیری ماندووە

نێچیرێکی زامدار بە چۆڕەچۆڕی خوێن

تاکە ڕێگایەتی ڕێگای بەرەو تاڤگە

نە بەڕواڵەت شادە، نە ماتە و نە، زوێن



***

له هاتووچووی دەماودەمی کاتەکانا

بەیان بوو بە پاشنیوەڕۆی دوور و درەنگ

باوێشکێکی کێشا، هەستا و کلکی بادا

دیارە دیسان بۆنێکی کردووە پڵەنگ

بەڵێ، بۆنی خوێنی کردووە پڵەنگی مەست

ئەم سامناکە جوانە ، چالاک و شکۆدار

لەخۆبایی لە خۆی زیاتر نابینێ کەس

لووتکەی چیا دەگرێ کە مانگ بێنێتە خوار

شەڕانییەک کە زەبری دەست و پەنجەکەی

لە عەرز ئەدا وەکوو مناڵێ، وشترێ

جیا لە شێر، فیلە ، بوێرێکی بوێ

جیا لە ئاو، خوێنە بخوازێ ئۆگرێ

دیارە ئێستا بۆنێکی کردووە و سروشت
گەڵاڵەی هێرشـێکی بۆ دادەڕێژێ
بە گوێی هەڵدراو، کلکی لە بۆشاییدا
چەندەها هێڵی سامناکی پێ دەکێشێ

ئێستا بە دووی بۆندا هەڵدێ هەر بەو چەشنە
لە گورگ هەڵدێ، کەروێشکێکی داماو لەپڕ
پەڕاوی سەوزی تاکە ، تا بەسەرهاتێ
بە دێڕی سوور تۆمار بکا، جەنگەڵی چڕ
***
کۆساری ڕۆژئاوا چەشنی کەلاتی خوێن
خۆرەتاو پڕ کڵپە و بڵێسە دار و سوور
هێندەی نێوان نەمابوو تاو و لووتکەی کێو
تا ڕۆژ ئاوا بێت و تاریکی بێتە ژوور

پیرە ڕاوچی هەناسە سوار و هانە هان
بە هیلاکی دەڕۆشت و گاڤی هەڵدەگرت



نێچیر لە بەستێنی تاڤگە ڕاکشابوو

چل هەنگاوی دیکە لە ئامێزی دەگرت

هەرچەن ماندوو بوو، بەڵام شاد و بێئارام

ئێستا خۆرەتاوی ئامانجی هەڵدەهات

خواستەکەشی وا بوو لە داهێنەری چەرخ

کە بەرهەمی ئاواتەکەی بکا خەڵات

ئێستا کە ڕەوتی ڕۆژ بەرەو ئاوابوونە

ڕاوەکەی کەوتووە لە سەر ڕێی تاڤگەدا

تاوێکی دی دێت و خاوێن دەیشواتەوە

بە دەستی لێهاتووی لە بەرپێی تاڤگەدا

لەپڕ بیستی گرمە و شریخەیەک لە پشت

ئەوسا زەبری دەستێ، کە لێی بڕی نەفەس

هاوارێک و تەکانێکی لێدا بەڵام

بڕستی لێبڕا و چەکی نەما لە دەس

کەفچەرێن و تووڕە و بێ بەزە و بە هاوار
بەو چەشنە کە سێڵاو پەتێ شل ئەپسێنێ
پڵەنگ لە ژوورسەری وەستابوو ئەیدڕی
هەروا کە گورگ سکی مەڕێکی دەردێنێ

ڕۆناهی کاڵ ئەبوو لە ڕواڵەتی ئاسمان
سامناکی ڕەش زاڵ ئەبوو بە سەر ئاسۆدا
شەو بە وێنەی مارێ دەخزا و دەهاتە پێش
تا دارستان پەردەی خەو بدات بە خۆدا

ئێستا پاڵی داوەتەوە پڵەنگی تێر
وێنەی مەلێکی ئاسوودە لە هێلانە
دەلێسێ، دەچێژێ، دەمژێ و بێئاگایە
سەرگەرمی خاوێنکردنەوەی دەم و ددانە

خوێناوی و هەڵدڕاو، بە وێنەی پێڵاوێک
لەولاوە کەوتووە پاشماوەی پەیکەرێ



دەستێ جیا لە باسک و پایێ لە مەچەک

لە شوێن خۆیدا نەماوە گەردن و سەرێ

دەستی بێ باسکی ڕاوچی پیر کە کاتی جەنگ

پەنجەی هەڵێناوەتە سەر شانی پڵەنگ

وا نیوەتاکە و با، لە چنگی دەڕفێنێ

ئەو چنگە پەشمەی وا بە چنگی هات لە جەنگ

خشڵی قامکی ئەو ئەنگوستیلەی کە بوو،

نقێمی پیرۆزە و ئاڵقەی، تەلی ساکار

پیرۆزە ئاقێقە و زێوەکەی زێڕی سوور

بڕوانە سەرسامی ئیکسیری ڕۆژگار

لە توێی ئەڵقە و قامکیدا بەجێماوە

لە چنگە موو، تاڵێ، کە با دەیشەکێنێ

ئەمە دوایین تاڵانی هەشتا ساڵ شەڕە

کە وا تەزی مردن، موچوڕکی پیادێنێ

لە شوێن ڕووداوەکە چل هەنگاو بەولاوە
نێچیری ئەنگاوتە لە خۆڵا گەوزاوە
دەمی تاکی بە ئاو گەیشتووە ، بەڵام
لە سەر ڕووبار گیانی شیرینی داناوە

***

بە سەر بەردێکا دێتە خوار تاڤگەی زێوین
مرواری پرژێنە ، بە بەژنی شۆڕەوە
هەزار گەوهەری نوێ لە ئامێزی سۆلاڤ
پێدەکەنین بە دەم دواتیشکی خۆرەوە



جەنگەڵ ئۆقرەی لە قووڵایی شەو گرتووە
کاسە و گوێی نابیسێ، چاویشی نافڕێ
سەوزەپەری لە باوەشی دێوی ڕەشا
بە سەرهاتە خوێناویەکان، لە یاد ئەسڕێ

سەقز ۱۳٤٦ هەتاوی

# ڕۆژهەڵات

شکاندی تابۆی دەستەوەستانی

ڕۆژهەڵاتـەکەم، خۆم بە قوربانی

چۆتە ترۆپک و لووتکەی هیوای گەش

«گەل»، تەنیا چارە، لە بۆ ڕۆژی ڕەش

بووژاوە دیسان چرۆی ئاواتم

بە شنەی ودمی لای ڕۆژهەڵاتم

دیسان «کرماشان»، هەر «کرمانجانە»

بڕبڕەی پشت و چاوی کوردانە

وانەی ئەمڕۆمان، کە یەکگرتنە...

تەنیا ڕێگامان، بۆ سەرکەوتنە

تاکوو دەگەینە دوندی سەرخۆبوون

دەس هەڵناگرین لە گەل و ڕابوون

٢٧ی خەزەڵوەری ٢٧١٧، ئۆتاوا



# ڕۆژمێر

ساڵ،

سێسەد و شەست و شەشە

چی ڕۆژمێرە

بۆ گەلانی سەر گۆی زەوی

پڕی جێژن و

پڕی ڕۆژی شاد و گەشە

بەڵام بۆ کورد

نەک هەر

ساڵ و مانگ و ڕۆژی

نەک هەر،

کاتژمێر و خولەک

بەڵکوو چرکەکانیش،

ڕەشە

ئۆتاوا، خەرمانانی ٢٧١٨



# ڕەقیب

ئەو کەسەی مەستی نیگاتە یاڕەبی دێوانە بێ

ئەو دڵەی شادە بە وەسڵت یاڕەبی وێرانە بێ

ئەو دەسەی ئاڵا لە دەوری گەردنی بێگەردی تۆ

یاڕەبی بشکێ و مورادی خاوەنی گیرا نەبێ

شیعری پەنجاکان

# سایە

پەڕوباڵم وەری، سایەم ڕەواوە

تەنانەت، کەڵکی مەرگیشم نەماوە

بەڵام تیریژی تاوی چاوی مەستت

گوڵی هیوام دەپشکوێن لەم هەناوە




# سازی ناکۆك

وا گەلاوێژە لە توونی گەرمام
ڕووگەمە شەختە لەمەدوا گەر مام

کۆمم و کۆم و ڕەوی تاوی تاو
دووڕپەرێز مام و نەما چیتر کاو

لام جیاوازی چییە ڕۆژ و شەو؟
چەم کە نەیبینی گوڵی کوڵم و لەو



تاکوو هاتن گوڵ و موڵ تۆرا بێن
چۆن دیە و دڵ بە بەڵای وا ڕابێن!

ژوانگە تاریک و تەریک ئەنوێنێ
کە نەما تین و تەوانی دوێنێ

چوو بە سەر دۆخی لە گوڵ ئاڵانم
سازی ناکۆکە دڵەی ناڵانم

پیرم و شەختە لە باخی داوم
پەلتەکی زەردی لە بەر جێماوم

چەم لە سۆ بێ بەرییە و باڵا چەم
خەزەڵی ژین دەوەرێن وا کەم کەم

ژوان ئیتر خەونە ئەوینیش کەونە
پێوەنابێ دڵ ئیتر بەم تەونە

زەردە باخی تەمەنم پاییزم
لە هەموو کەس، لە هەموو شت زیزم...

ئۆتاوا، هاوینی ٢٧١٨





# سەد و بیست

ئەوەی دەناڵێ لە دەست ئێشی پشت

ڕەچەتەی «عەبە» ڕێی چارە بۆ گشت

دەمەوبەیان و شەو پێش لە نووستن

«کوت» بوەشێنێ سەد و بیستی خشت

بە دڵنیایی ڕزگاری دەبێ و،

ئالای لەشساغی دەگرێتە نێو مشت

هەر بژیت «عەولا» لە بۆ ڕەچەتە و

ئەو ئاوە پاکەی بۆ میللەتت ڕشت

۱۹ی سەرماوەزی ۲۷۱۸، ئۆتاوا

لە سەر ئەو ڕەچەتەی کە بەڕێز کاک عەبدوڵای ساتێڵایت پێشنیاری کرد بۆ ئەوانەی بە دەست ئێشی پشتیانەوە، دەناڵێنن.

# «سەنگام»ی سەقز

یەکەم جار هاتە گوێم «سەنگامی» سەقز
ڕەوی دەرد و خەم و ئالامی سەقز
کە دیم گەنجێ لە گەنجانی قەدیمی
چریکەی دێ لە ماڵ و بامی سەقز
دڵم خۆش بوو نەما چیتر کوڵ و خەم
کە بیستم شیعر و بەستە و قامی سەقز
لە سەقز تاکوو دێهلی و چین و ماچین
هەموو چەشتەن لە چێژ و تامی سەقز
«عەلی ئەسغەر» وڕە واقی کە بیستی
نەوای «هورموز» لە سوبح و شامی سەقز




«حەلیم» و «باسیت» و «زیرەک»، «شەجەریان»
لە ئاست نەغمەی »حەمە »، سەرسامی سەقز
سەرم بەرزە کە وا هێڵی بەزاند و،
جیهانی بو لەمەدوا، نامی سەقز
خەمی چ بخۆم ئیتر لەم هەندەرانە
کە شیرینە لە «هورموز»، کامی سەقز



ئۆتاوا - گوڵانی ٢٧٢٠
بۆ کاک حەمەی هورموزی و گۆرانی «سەنگام»

# سەربەخۆیی

نەک هەر جارێ، هەزاران جار " نا "، بۆ
دیلی و دەستەڕۆیی

بەرسیڤی من چەپکێ گوڵی، " بەڵێ "یە بۆ:
سەربەخۆیی

ڕەزبەری ٧١٧٢، ئۆت



# سەیران

چ سەیرانێ، چ سەیرانێکە ئەمشەو
گەڵاڕێزان و گڕبارانە ئەمشەو

کزەی جەرگ و هەناو و ئاهی دایک
تەزووی ناخ و دڵی بابانە ئەمشەو

کە چل گۆپکەی گوڵی ناران لە ناران
لە نێو جەرگەی گڕا برژانە ئەمشەو

هەموو گەردن بەکوێن، سەرگەرمی شینن
کە شیناوێ، مەکۆی چل ژانە ئەمشەو

بەچی ئارامی کەم ناخی پڕ ئاخم
کە چاوەی چەم، خوێن پرژانە ئەمشەو

ئەوا پۆلووی لەشی چل ناسکە کۆرپەم
بە دووکەڵ بوو، تەم و دوومانە ئەمشەو

سەر و جەرگ و هەناو و دڵ هەموو سووت
کە فیستیڤاڵی دەرد و ژانە ئەمشەو

لە باتی بابەگورگورِ، گۆڕی «سەیران»
هەوار و ڕووگەی کوردانە ئەمشەو

چ سەیرانێ، چ سەیرانێکە ئەمشەو
گەلاّ ڕێزان و گڕبارانە ئەمشەو...

سەرماوەزی ٢٠١٢- ئۆتاوا

بۆ "شیناوێ" و گولّە پڕووزاوەکانی

# شالّی سەوز و زەرد

شالّی سەوز و زەرد هەردوو دەردن دەرد
سەری هەزاران کوردیان دا لە بەرد
سالّ هێشتا نەچووە لە چوونی کەرکووک
سەری هەلّداوە گەمەی کتک و جەرد

ئۆتاوا، ڕەزبەری ٢٧١٨



# شێخ ڕەزای سانی

لە هەجو و زەمدا، شێخ ڕەزای سانیم

شانێکم لێدە ئەگەر پێت وا نیم!...

ئۆتاوا، خەزەڵوەری ٢٧١٨

# شاری چۆڵ

بە سەر چوو ساڵ و هێشتا چاوەڕێمە

بە کۆچت دەشتی هیوا زەرد و دێمە

دەر و کۆڵانی شارم چۆڵی چۆڵە...

کە تۆ چووی، خۆشی تۆرا لەم هەرێمە

ئۆتاوا، ٦ی بەفرانباری ٢٧١٧

بۆ کۆچی دوایی پووری خۆشەویستم،

دادە نەسرەت شافێعی



# شەم و شەمچە



هەستای هێنات شەم و شەمچە
بۆوەی، ڕووناکی بێتەوە

بەڵام پێویست ناکا بە شەم
کاتێ کە برق، ئەکوژێتەوە

چونکە لە سای خۆری جوانیت
دنیامان، دەدرەوشێتەوە

تۆ خۆت، شەم و شەمچە و چرای
نووری عالەم بە پێتەوە

چاوت «ملوێن»، مێگاواتە
هیچ کات وزەی، نابڕێتەوە

هەتا تۆمان بیت، ئاسوودەین
گەر کارەباش، بکوژێتەوە



ئۆتاوا. ٢٦ی سێپتامبری ٢٠١٧ لە کاتژمێری ٨:٣٠ هەتا ٩:١٠ خولەک، کارەبامان نەبوو و منیش ئەم چەن دێڕەم دانا بۆ مێهری هاوژینم.



# شێری باکوور

له حەسرەت دۆخەکەی ناسازی باشوور

دڵم زوور و، بەژی هیوام هەموو بوور

بەلام ئەمڕۆ لە خۆڵی ژیلەمۆدا

ژیانم دی، لە نرکەی شێری باکوور

بۆ بەڕێز: عوسمان بایدمیر

١٣ی دیسامبری ٢٠١٧

ئۆتاوا



# شێری کەڵاتی هەولێر

شێری کەڵاتی هەولێر
هات و بەلەز گەڕاوە
تا هاتین بیدوێنین
خۆی بزر کرد لەو ناوە

پاش چوارساڵان کە دیتم
لە دوکانی مام بالییز
چاوم بووبوو بە مەزرەق
مێشکم دەیکرد ویزەویز

تا نەیانگوت «مامۆستا»
نەمزانی کە ئەو زاتە
مامۆستای **«ئاپگرەید»**ە
لە نێو ئەو بەرگ و قاتە

ماوەیەک واقم وڕ ما
لەو دیمەنە کەم وێنە





تا مام باییز دەنگی دام:
زوو کە!.. بە خێری بێنە!..

گوتم: بە خێر بێیتەوە
تو خوا کەمێک بۆم بدوێ
چی بوو هۆکاری ئەوەی
هەمووومان چووینە پشت گوێ؟!..

هەوای هەواری نوێیە؟
کە وا لێمان تۆراوی
یا دڵ ناسک بۆتەوە..
یان... تەواو باشووراوی!..

مەیلت بۆ کوێ باڵی گرت
کە وا ئیتر نەماوە!..
چت بەسەر هات لە باشوور؟!..
ئەی هاوڕێی «تازە زاوا»

چۆن بوو ماوەی چوار ساڵان
کەست نەدواند لەوێوە
ئێستا بەم پەلەپەلە
چی تۆی هێنا لە ڕێوە؟

مەیلی هەواری کۆنە
تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟!...
یان ڕازێ سەربەمۆرە
توخوا لێمان مەشێرە..

چۆن دڵت هات جێ بێڵی
هەواری تازەی باشوور
ئەو هەموو ڕێگات پێوا
بەرەو ئەمریکای باکوور؟!...

«ساڵ»ت بەزاند ئەم ماوە
قژت هەروا ڕەش ماوە
سەر کوڵمەت وەک گوڵی سوور
خوێنی تازەی تێزاوە

پێستت ڕەنگی گۆڕاوە
قەد، شمشاڵی تەواوە
بۆ ڕازی ئەم «گۆڕانە»
دەر ناخەی؟ تازە زاوا

چاوەڕێی وڵامێک بووین
لە لایەن مامۆستاوە



وەک شێر هاتە گۆڕەپان
بە نرکە جوابی داوە

ئەو بوارە دەست نادات
بۆ هەر کەس بە سانایی
پیاوی بەجەرگی دەوێ
نەک دوودڵ و ڕاڕایی

«نوێخواز» بێت و خاوەنڕا
دووی دۆی تازە بکەوێ
لەسەر هەواری کۆن بوون
دەتلێ و پەکی دەکەوێ

جا هەڵیواسن لە گوێ
پەندی منی مامۆستا
مەوەستن، هەستن، ڕابن
«ژنێ بێنن هەر ئێستا»

پایزی ٢٧١٥ - ئۆتاوا - کانادا



# شەرم ناكەی؟!

بە هۆی دیداری پۆپ لە ڤاتیكان لە تەك سوڵتانی فاشیست و زارۆكوژی تورك و هەروەها پێدانی خەڵاتی فریشتەی ئازادی، لە لایەن بێ ئەخلاقێكەوە، بە فاشیستێكی تا مۆخی ئێسقان گەندەڵ و شەڕخواز.

دهۆ و درۆ و تاوان تا كەی؟...

تۆ هیچ شەرم،

لە تەرمی ڕووتی «بارین» و

لەشی ورد و بچكۆلانەی

پارچەپارچەی،

زارۆكانی «عەفرین»

ناكەی!؟...

چڵ ملوێن تف لە ناوچاوت

بۆ خۆت و خەڵاتی قۆڕت

بۆ خۆت و میوانی دز و،



دزێو و ڕژد و،

سەرشۆڕت

ئەوەی سەری منداڵ ئەبڕێ

تۆ دەیدوێنی؟!...

ئەوەی هەتا بیناقاقای،

شەڵاڵی خوێن و تاوانە

بۆ دیوەخان و تالارت

بە خێر دێنی؟!...

دەبێ بمری و،

سەرت داخەی

جەنابی «پۆپ»..

داناڕزێی؟!...

شەرم ناکەی؟!...

ئۆتاوا، ١٦ی بەفرانباری ٢٧١٧



# شەشدانگی جوانی

خۆزگە تاوێکیش لەو دڵە شێتەی منی دەڕوانی
ئەو کەسەی پێیدای تاپۆی شەشدانگی شۆخی وجوانی
ئۆتاوا ، ڕێبەندانی ٢٧١٦



# شەست و نۆ

پیاسەمان دەکرد لەتەک موحسینا لە ڕێی «گاتینۆ»
خێوەتێکمان دی ، گەلێ بچووک و ورد و گرد و کۆ !

لە سای خێوەتا ، پیاوێ تەژە و دۆتێ وەک گەزۆ
پرسێکی ساز کرد لە چاو و هزری کونجکۆڵی تۆ

ئەوسا ڕووی دەمت کردە من وەها پرسیارت کرد
ئا لەو خێوەتە تەنگە چۆن جێیان دەبێتۆ ئاخۆ ؟!



هەر چەند دەزانم بۆ خۆشت خیبرەی ، سەگی بەشی خۆ
بەڵام قەیناکا ، پێت دەڵێم کە چۆن جێیان دەبێتۆ

دێری خوارەوە پوختەی وەڵامی منە لە بۆ تۆ
بە کاری دێنن فەن و تێکنیکی تەڕی «شەست و نۆ»

گاتینۆ پارک، ڕەزبەری ٢٧١٥

# شەست و پەنج

شەست و چوار پەڕی و هاتمە شەست و پەنج
بەڵام دڵ هێشتا نەرمە و تەڕە و گەنج
کۆتەداری پیر ، دەبێتە گڕکان ،
بێتوو لێی بدات شۆڵەی چاوی قەنج

ئۆتاوا - ڕەشەمەی ٢٧١٨




شێخ گەرەکیە ساز بکا باڵکۆن و بانیجە و تراس
دابمەزرێ و چاو بگێڕێ بۆ مەتاعی جوان و خاس

ئێستە هەشتایە و کەچی هێشتا لە هەشتا سەیر ئەکا
مەیلی گۆشتی ڕانی بەرخ و تەختی سینەی تەیر ئەکا

هەرچی هەوڵی داوە بێسوودە و هەنووکە چاوەڕێ
بەرجەوەن شەقڵ و تەلیسمە و هیچ کلۆج لێناگەڕێ

شێخ لەتەک فەشن دەجووڵێ و حەز بە بورجی سێ نهۆم
بۆتە خولیا و بیر و هیوای تەک تراسی ڕوو بە چۆم

بەرجەوەنخوازە و تەڕەدڵ، بەرپەزێرە و بەرنەواز
سەد بەڵێنی پێدراوە بۆ کەرەستە و بۆ جەواز



ئێستە سێ ساڵە لە ڕیزی ئاسن و سیمان و گەچ
شارەداری بۆتە جێ و ماوای بەڵام بێسوود و وەچ

شێخی ئێمە فێرە نوێژە ، نوێژی تووڵانی و درێژ
بەس بە مەرجێ بەرجەوەن پڕ بێ لە جوانی و تام و چێژ

خەونی شێخ و بەرجەوەن تەنیا نە هەر خەونی ئەوە
بەڵکوو شارێ دەس بەدۆعان بێتە دی بۆی ئەم خەوە

پڕ بە دڵ هیوامە شۆرای شار و خەڵک و شارەدار
باسکی لێ هەڵماڵن و شێخمان بکەن بانیجەدار

ڕابخات خاتوونی ماڵ ئەوسا لە بۆ شێخ فەرشی سوور
شێخ وەکوو " ئالێن دۆلۆن " ڕاکێشێ لاق و دوور بە دوور

سەیری بەژن و لار و لەنجەی کیژی جوان و شۆڕەژن
لابەرێ هیلاکی چەن ساڵەی لەشی شێخی گژن

**ئۆتاوا ، جۆزەردانی ٢٧٢٠**

بۆ شێخێکی شارەکەمان کە مۆدێلی سازکردنی
باڵاخانەی سێ نهۆم بووە بە خەونی .

# شێخ و شلەنگ

شێخی گەڕیدە با بەس بێ جەفەنگ
عالەم زانیویە بە قەزیەی شلەنگ

لە دۆزەخدەرە هەتا ئۆتاوە
باس تەنیا باسی باخچەی بێئاوە

ئەی چاوگەی زیکر و فیکر و کەرامات
شێخی ئەوراد و نووشتە و مەقامات

نموونەی ئاکار، شێخی چاو خومار
ئەی ژنپارێزی بە کردە و کردار

ویردێ دابدە خێرا و بێ درەنگ
بەڵکوو دەرکەوێ حەشارگەی شلەنگ

تاکوو ئاو بخوات باخچە و دار و گوڵ
خێرت بگاتە لق و پۆپ و چڵ

بیستوومە ڕووگە و قیبلەت گۆڕیوە
چیتر دانادەی نوێژت لەو دیوە

لەوەتەی دیوتە سینگ و باسکی ڕووت
کۆڵەکەی حەزی جەوانیت بزووت



ئێستا شوێنی نوێژ بان گوڵخانەیە
چاوی مۆلەقت لەو بەژنانەیە

کە دێن و دەچن باخچە ئاو دەدەن
دڵت وەک کوورەی ئاگر تاو دەدەن

دیارە وەک شێخ و وەکوو چاوگەی دین
لە خشتەی بردووی ئیبلیسی لەعین

تکایە شێخی ناوقەد وەک قەیتان
تەشریف بێنە خوار لە کەلی شەیتان

بە ویردێ شوێنی شلەنگ بنوێنە
ئەی زاتی تەوێڵ چەشنی ئاوێنە

واز بێنە ئیتر لە گەمارۆی ئاو
بەڵکوو دۆخی دێم ببێتە بەراو

تێراو بن سەرجەم هەرد و گوڵ و باخ
دڵی خاوەن ماڵ لێی بڕەوێ ئاخ

بخەملێ حەوشە و دەر و دەروازە
تێک ئاڵێن گوڵ و شۆخی ناوازە



تۆش لە سەر بەرماڵ لە بان گوڵخانە
خۆشحاڵ بڕوانی لەو وێنە جوانە

بێن و ڕابوورن وەک پەریزادە
تۆش ڕازی و دڵخۆش لە بان سەجادە

ئەی لەخواترسی بە لاچاو سەیرکەر
ئێستا کە هەوای بەر داویە لە سەر

لە خۆت تێک مەدە ئەم دۆخ و دەورە
با لێت ڕازی بن بچووک و گەورە

تا بیلاتەشبی دەرکەوێ شلەنگ
خولقی موبارەک چیتر نەبێ تەنگ

بۆوەی ئەم قەزیە پەیدا نەکا بێخ
داخرێ پەروەندەی شلەنگ و یاشێخ

ئۆتاوا، ١١ی پووشپەڕی ٢٧١٩

بۆ شێخزاتێکی دڵتەڕی دەڤەری دۆزەغەرەی سەقز

# شینگێڕی

# مەلا تەوفێق

بەجێیهێشتین بە خۆی و ددانی شاشی
بە هیوا بوو زیادی کەین مەعاشی
بە ناڤیگەیشن و پرسین لە خەڵکی
چلۆن بەو بارەوە تۆ دەچیە ئاشی!

ئەتۆ فەرمووت: سەعاتی حەڤدە دۆلار
ئەدا سەنتێری کانگرێس بە منی بێعار
بەڵام وەڵڵا هەمووی هەر فلّتەفلّتە
ئەدی بۆچی بە حەو دۆلار دەکەی کار؟

ددان وەک کۆڵەکەی مزگەوتی کۆنە
سەر و تەرحت بە وێنەی پیتی ڕۆنە

خەجاڵەتبار ئەبن سوێسکە و کەوی شاخ

دەڕۆی کاتێ بە وێنەی قاز و سۆنە

عوتووری شەوگەلی پاریس و لەندەن

بەرانبەر بۆی دەمت هەر عەبد و بەندەن

هەناسەت بۆی پەتاتەی کۆن و نۆکە

لە ژێر و ژوور وەکوو یەک ڕیشە کەندەن

لە دووری تۆ گەلاڕێزانە ئەوڕۆ

«بێلا» دڵتەنگ و چاو گریانە ئەوڕۆ

لە خاوەن بیزنێس و کووک و درایڤێر

هەموو بێزار لە وان فۆڕ وانە ئەوڕۆ

وەرە ئەی یۆسفی میسری سەدەی بیست

وەرە ئەی ناوەکەت سەر دێڕی هەر لیست

وەکوو قۆچی جەژن خۆت کرد بە قوربان

بەڵام ئەو بێوەفا نەیویست، نەیویست



وەرە تاوێکە دوکانت نەدیوە

بە بێ تۆ مشتەری هەر وەک هەتیوە

وەبیرم دێ کە بەو دەسرەی دوکانێ

سەدان جار لووتی خۆتت پێ سڕیوە

بە دەنگی داوودیت قەلبت دەلەرزان

بە دەستی چڵکنت گونکت دەگەوزان

گەلێک پێت خۆش بوو شوێنی ئیشی تازە

بەڵام داخم لە دەستت چوو بە هەرزان

مەلا گیان بۆچی تۆ دەرچووی لە خۆڕا

ئەتۆ چووی، گشت هەوای ئەم شوێنەگۆڕا

کە تۆ بێوادە ئاوا کۆچت فەرموو

هەموو وەک ماسی گیرۆدەین لە تۆڕا

جەماعەت هەر خەریکی شین و ڕۆڕۆن

کش و حەیران و مات و دەستەوئەژنۆن

چ سیرڕێ بوو کە بەم کۆچەی جەنابت
هەموو تێکرا شڕ و بێتاقەتی تۆن!

ئەوە کێ بوو کە وا بێکاری کردی؟
لە وان فۆڕوانی مە بێزاری کردی
ئیلاهی سەد کەڕەت هەڵچێ هەویری
کەوا مەحرووم لە ڕووی دڵداری کردی

هەموومان هەر وەکوو ئازیزمەردە
کزین بۆ دیدەنی ئەو ددانە زەردە
بەدڵ ڕۆژێ هەزارجار دەست بەدۆعاین
کە ڕەحمێ هەڵقوڵێ لەو قەلبە بەردە

حەلیم و ئەترەش و کولسوومی قامویژ
لە دەنگت موعجیب و کاس و وڕ و گێژ
لە فیکراین و دەکەین تەگبیر و ڕاوێژ
چ بوو سووچمان، کەوا تۆ چووگی لە نوێژ



وەرە دیسان بە زەردە و پێکەنینت

ببەخشە بەم دوکانە تاو و تینت

ببوورە ئەو خەتاکارانە ئەم جار

کە بوونە هۆی فیراق و هیجر و قینت

**ئوتاوا، دوکان - خاکەلێوەی ٢٧٠٨**



## شەرم

گەردن و سینەت بلوور و غونچە دەم، زولفت شەوە

گوڵ کە زاری دی، بە زاریی، شەونمی شەرمی تکاند

# سڕ کردن

زۆر لە مێژە هاوار ئەکەین

تاکوو کوردستان،

یەک ماڵ بێ

یەک ئاواز و،

یەک وتار و،

هەر یەک باڵ بێ

بەڵام نەچوو بە گوێی کەڕی «سەوز» و «زەردا»

پاش «سڕ» کردن،

سەری حەز و،

سەرخۆبوونی میللەتێکیان،

دا بە «بەردا»...

چواری خەزەڵوەری ٢٧١٧، ئۆتاوا



# سووڕی دەوران

نامێنێ دنیا سەراو بن وەک ئەمێستا دێتە چاو

سووڕی دەوران دادەنێ هەر کەس لە سەر جێگەی شیاو

ئۆتاوا ، خەرمانانی ٢٧١٨



این چنین زیر و زبر عالم نمی ماند مدام

می نشاند چرخ هر کس را به جای خویشتن

«صائب تبریزی»

# سوێند

ئەی بای دژی ڕزگاریخواز
قەڵای گرژی دڕاوێ ساز
سوێند بە هیوای گەش و پیرۆزی کاک **فوئاد**
بە باوەڕی شۆڕشگێڕانەی **ئاوارە**

بە **سمکۆ**، بەهەڵۆی شۆڕشی دارێنە
بە قەڵبەزەی خوێنی خاوێنی **گیڤارا**
ئەی بای دژی ڕزگاریخواز
قەڵای گرژی دڕاوێ ساز

سوێندم بەتەرمی دابێژراوی کاک **یەحیا**
بە بڕوای خاوێنی **حەمەحسەینی** شەهید
بەجخاری دڵی **ئەنوەر**
بە تەوژمی تەمی پەژارەی **سەی ڕەشید**



ئەی بای دژی ڕزگاریخواز

قەڵای گرژی دراویّ ساز

سوێند بە بەریەی بە خوێن نەخشاوی کوردستان

بە ترۆپکی ئیمانی پیری چەک لەشان

بە ڕێژنەی چاوی کوڕکوژراو

بە خوناوەی، مۆسیقای هەستبزوێنی شوان

ئەی بای دژی ڕزگاریخواز

قەڵای گرژی دراویّ ساز

سوێند بە دڵۆ و غەوری پەنجە و ناخی هەژار

بە لێمشتی دواڕۆژی گەل

بە ئاسۆی ڕووناکی شۆڕش

بە ئاڵای سووری کرێکار

ئەی بای دژی ڕزگاریخواز

قەڵای گرژی دراویّ ساز

سوێند بە چەک، بە خوێنی ڕژاو
بە ڕەش و ڕووتی لێقەوماو

بە نەخەوتن، بە نەسرەوتن
بە خەبات، بە دانەکەوتن
بە یەکگرتن، بە سەرکەوتن
قەڵای گرژت ئەڕووخێنین

ڕەگی گەندەڵت ئەپسێنین
شوێنەواری چینایەتی،
لە ڕووی جیهان، ئەفەوتێنین
ئەی یاری دیلی و ژێردەستی،

ئەی بناغەی ڕژدی و پەستی،
دروشممانە، تا بمێنین
بژی مردن بۆ سەربەستی!
بژی مردن بۆ سەربەستیـی!...

سەقز - ١٣٥٨ی هەتاوی

# تاکەی؟

هەتاکوو کەی
کڕ و سڕ و
واقمان وڕ و
ترسمان یار بێ؟
تاکەی سەرمان لە شان
بار بێ
چاوەڕێی چین؟!
کاتێ لە بەر چاوی زەقمان
هەموو ڕۆژێ
چەن سەری سەوز
لە سەر دار بێ!...

ئۆتاوا، خەرمانانی ٢٧١٨

پێشکەشە بە خۆڕاگری ڕامین و زانیار و لوقمان



# تانیتا

**بۆ ٤٠ ساڵ ژیانی هاوبەش لە تەک**
**خۆشەویستەکەم «مێهری»**

هێژا و شەنگ و
دڵڕفێن و
نازدارترین و جوانترین
وێنە و دیاردەی ئەم دنیایە
نە ئاسمانە و
نە دەریایە
نە سەمای پەلکەی شۆڕەبی
بە سەر پەنجەی،
نەرمی شنە
نە درەخت و گوڵ و گوڵووک
نە دیمەنی خۆرنشینی



لە تویێی بوومەلیێڵا،
ونە

شۆخ و دەلال ترین وێنە و
دیاردەی دنیا
نە ڕووبار و چەم و کانی
نە پەلکەزیێڕینە و باران
نە شەتاوی سینەی چیا و،
نە چیمەن و تاڤگە و زنە
بەڵکوو تەنیا و تەنیا،
ژنە
ئەویش تاکە و
تانیتایە و
هاوژینی
شیرینی منە

پووشپەڕی ٢٧١٨، ئۆتاوا

# تاسه

سیی پاییزە،

چاوەڕوانی بەهارێکی

دیدارتانم

هەموو گیانم،

گەڵای زەردی تاسەتانە

هەموو کەس و،

ئازیزانم...

ئۆتاوا، پاییزی ٢٧١٧



# تاسەبار

هەڵـوەدام و کەیلە دڵ بۆ دیدەنی کوێـستانەکەم
تاسـەبارم، تاسـەباری خاکـی کوردسـتانەکەم

وا پەڕیوەی بێ پەڕ و پۆی هەندەرانم داخەکەم
هەرچی دەڕوانم دەبینم دوورە، دوورە ژوانەکەم

کۆڵەوارێکم ڕەبەن، ڕێبواری ڕێگەی سـەخڵەتم
شۆرەکات و دڕک و داڵ و بەردە ڕێگە و بانەکەم

کۆچەرێکـم هەڵگری سـەر من لـە پێناوی وڵات
ئـەو مەلـەم ئاکامـی کۆچـم دێمـەوە هێلانەکـەم

بەرزە هەنگاوم بەرەو ئامانجی سەرکەوتن دەڕۆم
تـۆف و ڕێبەنـدان و زریـان ناتەزێنـی گیانەکەم

دێم و بۆ ژوانێ دەچم تاپۆی شەو ئەدڕێنێ وزەم
ژوانی من ژوانی هەتاوە، ژوانگە کوردسـتانەکەم

تۆرەنتۆ، هاوینی ١٩٩٢

# تەنیایی

هەرکات پێڵاوی تاسەتان

هەڵیگرتن

بەرەو،

هەوارگەی کۆتاییم

نەرم و ئارام هەنگاو بنین

نەکا بڕمێ

دیواری،

تەسکی تەنیاییم...

ئۆتاوا، خەزەڵوەری ٨١٧٢

تێبینی:

ئەم تووتە شیعرە، وەرگێڕان نییە بەڵکوو، وەرگرتن و کورداندنی چەمک و مەبەستە.



به سراغ من اگر می آیید

نرم و آهسته بیایید

مبادا

که ترک بردارد

چینی

نازک تنهایی من

« سهراب سپهری »



# تەنیا ماچێ

پڕبەپێستی واتای مژین

لێوی تەڕت،

تورد و گوڵووکی و شیرینە



چێژاوی تۆی،

پەلکی گوڵاڵەی دوو لێوت

دڵگەرەکتر،

لە شەکر و شانەی هەنگوینە

تۆ بی و بزەی دلۆڤانیت

تۆ بەشقی نازداری و جوانیت

با بڕەوێ ئەم تا و تینە

خەڵاتم کە



تەنیا ماچێ،

بۆ سارێژی،

ئەم برینە...

٩ ی فێبرواری، ٢٠١٧



# تۆڵە

زۆر گەرەکمە تا لە ئامێزت گرم توند و گەرم

پڕ بە تۆڵەی دڵ بگووشم ناری سەر سینەی نەرم

چەندە ئازاری دڵت دام، هێندە من ماچت بکەم

تاکوو یەک بن باری ماچ و سۆی دڵی سەوداسەرم

سخت میخواهم که در آغوش تنگ آرم تو را

هر قدر افشرده‌ای دل را، بیفشارم تو را

" صائب تبریزی "



ئۆتاوا، خەرمانانی ٢٧١٨

کورداندنی بیرۆکەی ناسکی "سائیب تەورێزی".

# عوزری کۆڕۆنا

پەیامت هات و وەڵام قەوس و کەش

مامۆ لە نێوان چوار و پەنج و شەش

هەرچی هەوڵم دا دێڕێ ساز بکەم

هزرم دامابوو لە تاو پەتای لەش

دیسان لە ئاستی «نامۆ»ی مامۆستام

ئەمن مامەوە شەرمەندە و ڕووڕەش

«کۆڕۆنا» بۆتە هۆی گەلێ کەتنان

منیش لەو کەتنە نەبووگم بێ بەش

هیوام وەهایە بە گەورەیی خۆت

دیسان بمبووری و دڵت نەگری غەش

هەروەها دوور لە پەتای «کۆڕۆنا»

بمێنی شاد و ئازاد و دڵوەش

ئۆتاوا، کۆتایی ڕەشەمەی ٢٧١٩

بۆ کاک فاتیح موحەممەدی . ف - نامۆ



# ڤالێنتاین

له ڤالێنتاینی ئەم ساڵا

له جیاتی سێو،

مێخەک ڕێژی دڵم دەکەم

ئەوسا دڵی مێخەکرێژم

له تۆی پەڕەی خۆشەویستی

دەئاڵێنم،

پێشکەش بە تۆی، گوڵم دەکەم

ئۆتاوا - ڕێبەندانی ٢٠١٦

## وەڵامێ بۆ

# دوازدە ملوێنەکەی ئەمریکا

ئەوەی کە تۆ لێی دەگەڕێی

نە لە حەشارگە و

ئەشکەوت

نە لە پەسێو و

گردایە

بەڵکوو چریکەی «ئاشتی»یە و

لە هەناو و

گەرووی چل ملوێن،

کوردایە

ئۆتاوا - خەزەڵوەی ٢٧١٨

وەڵامێ بۆ خەڵاتە! دوازدە ملوێنەکەی ئەمریکا (دۆلار)

# وەسیەتچامە

مەیگێڕان بێن و پوورەی شینگێڕان لادەن لە گردم

بە سەر تەرممدا بادە بگێڕن ئەو ڕۆژەی مردم

لە بری بەرات ، مردووشۆرەکەم بە مەی سەرخۆش کەن

لە سەر تا باوان ، تێرتێر شەرابی ترێی پێ نۆش کەن

مەهێڵن مەلا بێت و دابدات خەتم و تەڵقینم

شیعرێکی تەڕی «نالی» بکەنە سووڕەی یاسینم

فاتێحەم نەوای ساز و مۆسیقا و بەستەی هەڵپەڕین

ڕەشبەڵەک بگرن ، چۆپی بابدەن ، خۆش کەن گڕی ژین

سینەم شێف کەن و بادە هەڵدەن و بیکەن بە جێژن

لە کەرتی دڵما شەتڵە مێوێکی ساوا بنێژن

بنووسن لە سەر بەردی گڵکۆما بە ئەمەگداری ،

لە غوربەت ژیا و سەری نایەوە بە تاسەباری

ئۆتاوا ، جۆزەردانی ٢٧٢٠



# روز مرگم...

هر که شیون کند از دور و برم دور کنید

همه را مست و خراب از می انگور کنید

مزد غسال مرا سیر شرابش بدهید

مست مست از همه جا حال خرابش بدهید

بر مزارم مگذارید بیاید واعظ

پیر میخانه بخواند غزلی از حافظ

جای تلقین به بالای سرم دف بزنید

شاهدی رقص کند جمله شما کف بزنید

روز مرگم وسط سینه من چاک زنید

اندرون دل من یک قلمه تاک زنید

روی قبرم بنویسید وفادار برفت

آن جگر سوخته خسته ازین دار برفت

ناسراو بە شیعری «وحشی بافقی» شاعیری کڵاسیکی ئێرانی بەڵام من دلنیا نیم و تەنیا لە بەر ئەوەی کە پێم جوان بوو ، کردمە کوردی .

# وەستای لێزان

خامە و زمان و هەستم پاک سووان
وشەت لێ بڕیم ، لە گۆ کەوت زوان

خەمڵ و ڕازاندن لە خۆتان جوانە
ئۆباڵ بە ئەستۆم ، بەڕاستی سوان

هەر چەند هەوڵم دا سپاستان بکەم
دێڕێ شیاوم بۆ نەهاتە ژوان

ناچارم هەر وا زۆر بە ساکاری
بڵێم دەستت خۆش مامۆستای لێزان

بمێنی و بیرت هەر گەش و گەشتر
خامەت پڕ گەوهەر ، پەنجەت گوڵباران

ئۆتاوا ، بەفرانباری ٢٧١٧

بۆ کاک زاهید ساڵحی کە دڵسۆزانە زۆر جاران لە سەر شیعرەکانم نەخشی ناوازە و جوان دادەنێ و کارەکانی لە ڕاستییدا ، شیعرەکان دەخەمڵێنن .



# وڕێنە

پڕووکا تاقەتم، سەبرم نەمانۆ
ئەوەی زامە، هەمووت سەرجەم کولانۆ
کە جێت هێشتین، چرای ماڵت کوژانۆ
من و کاردۆخ و ئاکۆ و دادە شانۆ
هەموو دەتلێین بە دەم ئازار و ژانۆ

لە بیرت دێ کە ماشینم دەئاژووت
ئەتۆم برد بۆ مەکۆی (بەیشۆر)، بە تانووت
هەڵتهێنا برۆ دڵمەند و لالووت
بناشتت کرد لە شێوەی گووگڵی شووت
بۆ نابینی؟!. ئەوا بەیشۆر بەرەوڕووت

وتم هەر کارێ تێیدا حیکمەتێ هەس
هەنوو دەخولێمەوە من وا بە ئەنقەس
زەمان کارد و، پەنیر وەک جەرگی بەندەس
مەپرسە لێم کە تۆ بۆ وا ئەکەی، چەس؟
ئەمن ناتانم هەڵبگرم لە تۆ دەس



دڵت بۆ حاڵەتم سووت و بزەت هات
کە بۆچی شین دەگێڕی؟ داد و هەیهات!..
گریمان من ئەوا شتێکم بەسەر هات
خۆ ژن بۆ تۆ نییە لەم شارەدا، قات
بە واوێژت، ئەمن یەکسەر کش و مات

لە تاوانا بە دوو دەم چوومە ( بەیشۆر)
جەوازی ڕۆشتنم بۆ کردی پامۆر
وتم بمبوورە سووچم بوو کەم و زۆر
چەمانرێتم، محاڵە لێت ببم تۆر
ئەگەر کۆ بن لە دەورم سەدهەزار حۆر



ئەوا ئێستا لە جیاتی دۆت و حۆری
لە ئاشپەزخانەم و چایی لە قۆری
پڵاو سازە و بە سەریا داومە مۆری
دەبی ڕازی بکەم سێ سەر، بە زۆری
کە بێن بۆ خواردن و منیان بە گۆری

جەنابیشت هەموو ڕۆژێ بە بیستۆک
لە دوورۆ وەک ڕیمۆتێ، من دەکەی کۆک
لە ئاستی زیرەکیت دۆش ماوم و شۆک



کە هاتیتۆ، بە گۆڕانم نەبی پۆک
ئیتر ڕابووم و قەت دانادەمۆ چۆک

وەکوو پەلتەک لە دووریت، زەرد و ژاکاو
وڕینەم دێ هەموو جارێ لە ناکاو
هەموو ئەندامی لەش، لێم بوونەتە چاو
کە تۆی پێ ببینمەوە، ئەی سەوزە لاولاو
بەبێ تۆ ژین چ ئاسێ!. دڵ چ داماو!.

ئۆتاوا ٢٩ی ژانڤیەی ٢٠١٧

## وسمه...

ئەوکی بەش و بەختی جۆر، ناکرێ بگری بە زۆر
بێ بەرە هەوڵی کلە و وسمە لە سەر چاوی کۆر

" سعدی "
کس نتواند گرفت دامن دولت به زور
کوشش بیفایدست وسمه بر ابروی کور

ئۆتاوا، نەورۆزی ٢٧١٩



# بۆ گڵکۆی
## خەبات

له گڵدایه، گلێنەی دوو چەمانم

(خەبات)م، کوولەکەی ڕۆح و ڕەوانم

چلۆن نەڕژێ لە دیدەم ئەسری خوێنین

کە وشکارۆیە باخی خۆزگەکانم

ئۆتاوا، گەلاوێژی ٢٧١٧



# خەڵات

ئەمساڵیش وەک هەموو ساڵێ
نەورۆز ئەکەین
بە ئاورگە و، گڕ و تەش و،
بڵێسە و تین
هەموو تاخ و شاخ و داخ و
لووتکە و چیا
دەکەینە بورکانی تۆڵە و
کڵی.
گەشاوەی ڕاپەڕین
دەبینە چەپکێ ئازادی
بۆ خەڵاتی چاوی گەشی
گوڵزارۆکەکانی،
عەفرین

ئۆتاوا، نەورۆزی ٢٧١٨



# خەونێکی وەریو

چلۆن دڵت هات جێم بێڵی!!

چۆن بوو کە ڕازی بووی بە کۆچ!

ساڵ و مانگ و ڕۆژم تۆ بووی

تۆش ڕۆیشتی و جێت هێشتم بۆچ؟!

قەت نەمتوانی بیسڕمەوە

لە تۆی دڵما یادی خۆشت

یا ئەو دەمەی کە منداڵ بووم

سەرم دەنایە نێو کۆشت

ساڵانی بەهاری عومرم

وا لە غوربەتا ئاوا بوون

خۆزگەی دیدارت تەمەنێ،

لە چاوانما قەتیس مابوون



ئێستا ئیتر چۆن دڵخۆش بم

بە وەرزی هاتنەوەی دوایی!

بە کۆچی تاڵی بێ وادەت

هەموو شت هاتنە کۆتایی..

من و غوربەت، تاسەی دیدار

بیرەوەری خۆشی لاویم

هەرچی هەبوو چۆڕایی هات

لە تۆی جەرگی حەسرەتاویم

دڵنیا بە خۆشەویستم

لە دڵ دەرناچی تا ماوم

تەنانەت ئەو دەمەش گەردوون

لە خاکی گۆڕ پڕ کا چاوم

بۆ یادی خوشکی خۆشەویستم خاتوو بەدری شافێعی

ئۆتاوا، ڕێبەندانی ٢٧١٩



# خەونی منداڵ

منێ کە سەرتاپا زام و
ژان و ئازار و
برینم
نازانم چۆن دانافەترێم!
نازانم چۆن
ناکوژێمەوە!
منێ کە چاوگە و چاوانەی
فرمێسک و ژان و
ئەسرینم
چۆنە کە مۆم ئاسا کزکز
دەسووتێم و
ناتوێمەوە!
سەیری هەر چی دەکەم
دەردە
سروشت مات و
ئاسمان تەم و
کۆمەڵگا،
داوەڵی داوڵ

منداڵ،
خەونی تەنیا نانە و
گەل بەلەنگاز
برسی و
زەردە
داماوم بۆ ڕێگە چارێ
شێواوم
تێکچووم بە جارێ
چی سەیر ئەکەم بە چوار دەورا
لە بری نان و ژیان و گوڵ
مەرگ و هەژاری
دەبارێ...
کۆتایی خەرمانانی ٢٧١٨ - ئۆتاوا





# خۆشەویستی

خۆشەویستی تاڵەکان شیرین ئەکا
خۆشەویستی ژاڵەکان هەنگین ئەکا
خۆشەویستی دڕک و داڵ و بەردەڵان ،
چەشنی گوڵزاری «ئیرەم» ڕەنگین ئەکا



خۆشەویستی ژان ئەکاتە ژینی گەش
خۆشەویستی شێر ئەخاتە باڵی مەش
خۆشەویستی مردوو ئەژیێنێتەوە
خۆشەویستی کرک ئەبووژێنێتەوە

خۆشەویستی بەرد ئەکاتە مێو و ڕۆن
دوژمن و ناخۆ دەکاتە خزم و خۆن
خۆشەویستی بێ ،... قەفەس وەک گوڵشەنە
گوڵشەنی بێ خۆشەویستی ، ڕووتەنە

خۆشەویستی کڕ دەکا هەرچی خەمە
خۆشەویستی پڕ دەکا هەرچی کەمە
خۆشەویستی خەمڵ ئەکا دیمەی دزێو
خۆشەویستی ، چەو دەکاتە زێڕ و زێو

خۆشەویستی نایەڵێ پەشکێ گومان
خۆشەویستی ، مار دینێتە زمان
خۆشەویستی قین ئەکاتە ئەشقی قاڵ
خۆشەویستی تین ئەخاتە ماڵ و حاڵ

خۆشەویستی بێ سنوور و کەوشەنە
بەرهەمی زانست و ئەندێشەی زەنە
خۆشەویستی هاوەڵی سەربەستی یە
ماکی ئینسان و سروشت و هەستی یە

ئۆتاوا ، ٢٤ی بانەمەڕی ٢٧٢٠

ئەم شیعره ژێوەرگرتن ( اقتباس )، لە شیعری: «محبت»ی مەولانایە . «از محبت خارها گل میشود» . واتە ، وەرگێڕان نییە و تەنیا وەرگرتن و کوردانندنی چەمکە .

# خۆزگە

پێم خۆشە لە چرکەیەکدا
بمتوانیبا
دنیاتان بۆ ژێر و ژوور کەم
کۆشک و تەختی داگیرکەران
بڕووخێنم
لە ژێر دنیای کۆنی خۆمدا
جەهەننەمێک بخولقێنم
ئەوسا بهێڵم
هەژارترین هەژارەکان
لە دەفری زێڕ و ئەڵماسا
خۆراک بخۆن
پۆشتە و پەرداخ
لە نێو بەرگی هەوریشمدا،
بێن و بڕۆن





بەڵام کارەکان سروشتین
لە قین و ڕق بە هێزترن

ئۆقرەمان لە بەر هەڵدەگرن

ئەی هاورێیان:

لەگەڵ ئێوەم گوێ ڕادێرن

دوورتر برۆن

دوور بڕوانن

خۆرەتاو لە نێو چاوانتان

پۆڵا لە نێو دەمارەکانتان

دابین کەن

شان و باهۆی بە هێزی گەل

هێژاترین خەیاڵەکان

بە ڕۆژەڤی ئەم دنیاوە

دەگیرسێنێ و

سەرسووڕهێنەرترین سەرسووڕهێنەرەکان

لە یەک دەمدا،

بە دی دێنێ...

وەرگێڕان، سەقز، ١٣٦٢ی هەتاویی

لە پەرتووکی ویژەی خۆڕاگری لە فەلەستینی داگیرکراودا

نووسینی: غەسان کەنەفانی

شیعر: مەحموود دەرویش

# خەندەی تاڵ

زۆر خەماوییتر لە شینە پێکەنینی تاڵی من
پێکەنیم ، بۆوەی لە گریان تێپەڕیوە حاڵی من
ئۆتاوا ، خەرمانانی ۲۷۲۰

خنده تلخ من از گریه غم انگیزتر است
کارم از گریه گذشتەست ، از آن می خندم
شاعیر : ( نادیار )

# خەزێنە

ناشێ جوانی «زین» ببینێ ئەو کەسەی وا «مەم» نەبێ
یا «وەلی» ئاسا بسووتێ گەر لە سایەی «شەم» نەبێ
ئەستەمە واتای ئەوین بۆوەی خودانی خەم نەبێ
(تۆ خەزێنەت یان نەدیوە یان لە نرخیدا هەڵەی
ناوی گەنجینە لە جێیەک بینە سینە و مەم نەبێ)
ئۆتاوا ، ٤ی خاکەلێوەی ۲۷۲۱
تێهەڵکێشی بچووک
لە سەر تاکە بەیتێکی مامۆستا «هێدی»



# خەیاڵ

خەیاڵی ژوانی کۆتاییم لە سەر، چڕ
هەناوم کانی هوون و ئەو دڵەم، پڕ
لە هەوری چاوەکانم وەشتی ئەسرین
دەبارێن و دەرووونم، دەشتی قاقڕ

ئۆتاوا - ٢٣ی ئاگۆستی ٢٠١٦



# ڕێسای نەگۆڕی دارستان

خونکارانی «واڵ ستریت» و
ئاغاکانی ،
ڤیلا و باغەکانی «داڤۆس»
ئامۆزاکانی «هێتلێر» و
خزمەکانی «مووسوولینی» و
سەیدەکانی هۆزی «چرچیل» و
گەشتاپۆی ،
شەیتان بازاڕی ئورووپا و
زەڕنەقووتەکانی «چەنگیز» و
«هۆلاکۆ» و
تاعوونی لیبراڵیزمی نوێ و
باڵیۆزەکانی «شیکاگۆ» و

کوێخاکانی ڕۆژهەڵات و
گزیرەکانی «کرملین»
موفتی و پاپی «ئەلئەزهەر» و
«ڤاتیکان» و
کڵیساکان ، کەنیسەکان



منارەکان ، ڕەبایەکان
کۆلکەکانی ئەستەمبوڵ و ،
قوم و بەغدا و ،
عەگاڵەکانی خەلیج و
نۆکەرانی دۆڵی بیزنیس
ڕێسای نەگۆڕی دارستان ...
ئەوەی دژی ،
شیعر و ژینگە و بزە و ژینە ...
هەموو هەرچی و پەرچی سەرڕووی ،
ئەم زەمینە
هەناویان ،
سەرڕێژی قینە
لە ئاست ئیرادەی «ڕۆژاڤا»
زاری بۆگەنیان ئاواڵە و
چاوەڕوانی هەڵلووشینە
وێنەی شەوە ،
دەستیان لە بینەقاقای زارۆکی
تازە ڕێکەوتووی ،
«عەفرینە»
چی کارتێڵ و
ئاژانسی سیکس و مەوادە
چی تەرەس و ، چی گەووادە

چی سوڵتان و ئیمام و
سەرۆکی دەڵەی
لای ئەنقەرە و تاران و شام و
بەغدادە

چەپ و ڕاست و پڕ و سادە
هەموو کپ و کڕ و ماتن
هەموو،
پەیکی مەرگەساتن
لە ئاست ئیرادەی ڕۆژاڤا،
وەکوو گوێی کەر،
هەموو لە هێڵێکدا
جووتن
بۆ بە تەفروتوونا بردن
بۆ قەڵاچۆی مرۆڤی کورد
هەموو یەکڕیز
چەک و تیغ و،
شیری ڕووتن...
چی شێواز و ئایدیالۆژی ئەم دنیایە
هەموو سەریان
لە هێڵ و،
ئاخوڕێک دایە



کورت و سادە..
کورت و سادە
هەموو پەنجەی خوێناوییان
لە توێی عەبای،
سوڵتانی سایکۆی ئەنقەرە و
فەقێی قوم و
کوێخای شام و
دەڵەدزەکانی بەغدادە
بۆوەی نەهێڵن ئازادی و
بۆوەی
بە دارا هەڵواسن
چی بیرۆکەی هەڵفڕین و،
چی،
هزر و بیری ئازادە...

ئۆتاوا، کانادا - ٢٠ی ڕەشەمەی ٢٧١٧



# یەلدا

لە تەک تۆمە، سیا خاڵی سیا چەم
سیا ئەگریجەیی یەلدایی پەرچەم

هەناوم بۆتە کوورەی ناری دیدار
لە یەلدای دیدەنت دەدوێ دەمادەم

لە سینە و کولْم و لێو و زار و دیدە
هەنار و سێو و پستە و نوقڵ و بادەم

هەموو نەخشی جوانی و سیحری یەلدا
لە خوانی شەوچەرەی تۆدا فەراهەم



منی دەروێشی دڵدۆڕاوی دڵدار
لە دەرگانەی کەرەمتا چاوەڕێ هەم،

کە بێم و وەک گەدای ئاتاجی دەرگات
لە عەتری ماچی دەم، پڕ کەی هەناسەم

بکەی ئاواڵە دەرگاهی دڵ و کۆش
لە ڕووی ئەمنی سەراپا حوزن و ماتەم

لە باخی پرچ و کولْم و لێو و گەردن
بئاڵێم و بتارێنم کوڵ و خەم

سەری سەوداسەرم دانێم لە سینەت
هەناسەم باوەشێن کا باخەڵ و مەم

دڵەی پڕ حەسرەتم تێر بێ لە ماچی
دوو لێوی ئاڵ و شیلەی نوقڵی ناودەم

بسووتێم و بسووتێم و بسووتێم
لە گردی ڕوومەتت چەشنی گوڵ و شەم

لە ئامێزی گرم بەژنی زراوت
شەوی یەلدا، بەدی بێ خەون و تاسەم

یەلدای ٢٠١٧، ئۆتاوا



# یەلدای من و
# کاک حامیدی برام

لەگەڵ تۆمە برالەی هەندەرانی

کە ئێستەش وا لە ڕیزی دڵتەڕانی

هەوێنی شیعرکەت یەلدایە ئەمڕۆ

کە باسی نوقل و نار و سێوت هانی

وەرم بگرە بە شاگردی لە لای خۆت

نەکەی جوابم بە جوابی " لەن تەرانی "

یەلدای ٢٧١٧، سەقز





# وەڵامی من
# بۆ کاک حامید

لە ئاستی تۆ، سوای شیعر و مەعانی
زمان چۆن بێتە گۆ، بۆ " لەنتەرانی "

منی شاگردی دێوانەی خەرابات
لە کوێڕا فێر دەبووم بولبول زوبانی..

ئەگەر چێژم نەدیبایەت لە شیعری،
برای گەورە و، کەلامی نەغز و جوانی؟!...

یەلدای ٢٧١٧ ، ئۆتاوا







# یەختە

تۆپ کە لاچوو چ ئومێدیێ بە ژیان ماوە ئیتر !

هەر چی بێژن نەزەر و بیر و قسەی خاوە ئیتر

تۆپەوانێ کە چەکی کەن چ بەهای بۆی هەیە ژین !!

تاکوو نەمداوە بە دەمتا ، بڕۆ بەو لاوە ئیتر ...

ئۆتاوا ، ١٠ی ژوونی ٢٠٢٠



بە هۆی یەختە کردنی کاک «ڕیڤێر» سەگەکەی شانۆی کچم کە سەرەڕای ناڕازی بوونی من ، یەختەیان کرد و منیش لە ڕقا ئەم شیعرەم نووسی .



( بە ماچێ ئاوری دڵ ڕەنگە دامرکێ بەڵام هەرگیز

لە ڕێی ئەشقا ئەگەر بمرم ، تەقازای ناڕەوا ناکەم )

مستەفا ئاسوور

# پارێز و ماچ

کلیلی قوفڵی دڵ ماچە ، ئەمن پارێزی وا ناکەم

لە ڕێگەی ماچە دەتوانم لە ناخی سینە ماوا کەم

چلۆن پارێز ئەکەی کاکە ؟ ! ئەمن لەو چێژە ڕا ناکەم

بە ماچێکی تەڕ و شیرین کە لەو نازدارە داوا کەم

دەکەم پارێز لە پارێز و ، ئەشق پێم ئێژێ من وا کەم !

ئۆتاوا ، ٧ی خاکەلێوەی ٢٧٢١

وەڵامێ بۆ هەڤاڵی پارێزکارم کاک مستەفای ئاسوور



# قەقنەس

گەرووی ئاوازی ئازادیت ،
قەت نەسرەوت و
هەر ،
زەنا بوو
شاخ و بنار و ئەشکەوتت
بۆ هەر چی کوردە ،
پەنا بوو !
لە نێو کەشی گەرم و گوڕت
هەرچی ئاشقە ،
تەنا بوو
کەژ و یاڵت جێژوانی ،
دڵدارانی ،
هەمووڵا بوو
ڕاژێر :
ئێستا چ قەوماوە ؟ !
چیان بە سەرتا هێناوە ؟



**چۆنە لە باوەشی دایکا**
**هەڵۆمان ،**
**بۆتە قەقنەس و**
**تەنیا ،**
**خۆڵەمێشی ماوە ؟ !**

**ئۆتاوا - ٢٩ی گوڵانی ٢٧٢١**

**بۆ ئەو گەنجە ڕۆژهەڵاتییە ، کە لە بەردەم بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان لە هەولێر ، بۆ مافی مانەوە ، ئاگری لە خۆی بەردا .**





# مەی

هەڵکێشە لە مەی سەری لە سەودا مەستت
داشۆرە کوڵی دڵ و هەناو و هەستت
دەریایێ دراو و زێڕ و موڵکی دنیا،
قوربانی دڵۆپێکی پیاڵەی دەستت

۷ی خاکەلێوەی ۲۷۲۱ - ئۆتاوا

# عەبە ڕەمەزان

کابرایەک هەبوو لە شاری سە قز
زۆر حەزی دەکرد لە شتی نەرم و خز
هەر بەم بەهانە دەچوە بەر بازاڕ
دەی فرۆشت تێغ و بنێشت و سیغار

وەزەنی نەبوو بۆ هیچ پیاوێ
پێی خۆش بوو بەس خۆی لە ژن هەڵساوێ
سینگی لە پێش و سەر بە حەواوە
دەستی ڕا دەژەند لە هەر دوو لاوە



هەر وەکوو پانکە باڵی دەخولاوە
دەی پێکا هەرچی خڕ بوو لەو ناوە
وێنەی فڕفڕە بە باڵ ڕاوەشان
بە هەر فێڵێ بوو دەستێکی دەخشان

بەم کارە ئێجگار خەنی و ڕازی بوو
لە کۆڕی مێگەل ، هەر خۆی قازی بوو
ناوی ئەم کەڵە ، حەمە ڕەمەزان
بە بینینی ژن ملی خۆی دەشکان

هەرچەند ئەم زاتە ژنی هێناوە
بەڵام ئەو ڕەوتەی هەر تێدا ، ماوە
هیچ دەربەست نییە گەر کوێر و شەل بێ
بەو مەرجەی دایمە لە نێو مێگەل بێ

ئێستاکە نەوعی ئا ئەو پیاوە
کاپی و پەیست بووە و وا لە ئۆتاوە
ئەم کەڵەی ئێرە ناوی عەبەیە
هێند مەمە خوازە ، دەڵێی بەبەیە

هەتا خوا حەز کات زمانی چەورە
فەرموودەی نەرمە وەک لۆکە و هەورە
تەلەفوون دەکات لە بۆ وان فۆڕ وان
بە زمانی شیرین زۆر نەرم و نیان

هەر کە تێدەگات ئاشپەز فی‌مەیڵە
ئەمجار داواکەی پڕ لە دی‌تەیڵە
پێشکەشی دەکات داوا و سەلامی
حەواڵەی دەکات سیحری کەلامی

توخوا بە پەنجەی شووش و سپی و سۆڵ
دوو پیزا ساز کە بۆ منی کلۆڵ
هەویری تەسک و ساسی بێ لایت
تایبەت بە تەبعی ، عەبەی ساتێلایت

هەتا دە خولەک خۆم دەگەیەنم
هەم پارە و هەم دڵ هەر دووت بۆ دێنم
سەری بێ نرخم گۆی مەیدانی تۆ
منم هۆگری پیزای جوانی تۆ

فەخرە لە لای من ئەگەر ساتێلات
دانێم بۆ هەموو کوردی ڕۆژهەلات
میلی مەیلی من ، هەر بەرەو وێ یە
نازانم کوردی ئەو لا چی پێ یە ؟

ئێستاکە کە من وا بێ ژن ماوم
بۆ کوردی ئەولا سەر لە پێناوم



تێدەکۆشم تا بە داوی **دیشم**
لەباری بکەم قۆناغی ئیشم

سەر دەکەم بە نێو هەموو ژوور و ماڵ
لەگەڵیان دەخۆم دوو پیاڵە چای تاڵ
دا دەمەزرێنم بۆیان ، **ساتیڵایت**
هەواڵ دەپرسم لە ، **نیوو فلایت**

کێ تازە هاتووە بچمە سۆراغی
تا بەڵکوو بچنم گوڵێ لە باغی
بە کورتی هەوای داوێن و بەری
یەکسەر داویەتی لە تەوقی سەری

هەتا بفەرمووی ، زمانی لووسە
بەس بیری لە لای گرتنی **جووسە**
هەر وەکوو ڕاوچی بناری کەسنەزان
خۆی حەشار دەدات **عەبە ڕەمەزان**

لەو نێچیرانەی وا تەرە ماون
لە کۆڕ و ڕەوەی خۆیان جێ ماون
تازەکوورەن و بێ ئەزموون و کاڵ
**عەبە ڕەمەزان** دەیان بات بۆ ماڵ

بۆیان ساز دەکا سفرە و خوانی خۆش
ئاواڵەی دەکا ، دەرگای ماڵ و کۆش
بەڵام هەر وەکوو کورتانی جەجاڵ
هەڵ دەوەشێت و لێی دەبێ بەتاڵ

وا بزانم بە هۆی کۆن بوونی داوە
هەتاکوو ئێستا بێ هاوسەر ماوە
هیوام وەهایە ، ئا لەم ئۆتاوا
عەبە ڕەمەزان بکەین بە زاوا

ئاگادار بکەین کامیونیتی کورد
هەوڵی بۆ بدەن زۆر بە دەستوبرد
تا بەڵکوو بەختی ببێ ئاواڵە
نەجاتی ببێ لەو وەزع و حاڵە



ئێمەش ڕزگار بین لەو فرت و فێڵە
کە تووشی کردووین ئەو کەللە چێڵە

ئۆتاوا ڕێکەوتی ١١ ی جوونی ٢٠٠٨
٢١ ی جۆزەردانی ٢٧٠٨





# دەسرەکان

پەنجەکانت
لە بیرمە وەک دوو مەل وا بوون
پەڕ و باڵیان ڕادەکێشا
بە سەر دڵما
جا کە وا بوو
پەیدا بوونی شریخەی هەور
بە ئاسۆی تاریک بسپێرە
چاوەڕوان بە
چاوەڕوانی ماچی خوێنین
چاوەڕوانی
دەسرە و دەستی خاڵی من بە
تا بۆ منی
تا هی منی
لە بۆ مانم،
بۆ نەمانم
بە خەمی گریانەکانم،
ئۆقرە بگرە



دەسرەکانی دەست لێک بەردان
کفن ئەنوێنن

چلۆن لرفەی بایەک لە سەر خۆڵە مێشا
بیشەکێنێ...
مەگەر خوێنێ
بە قووڵایی نێو دۆڵەکان
ڕۆ بکرێ و،
بە ئاوازێ
لە چارۆکەی گەمییەکەی سەندبادا
بە کوڵ بگری
کوڵی گریانی دەسرەکان
ئاهەنگی سەد گوردان دەسڕێ
شادیم بۆ چاوپێکەوتنت
وادەیەک بوو
کە لە ژوانگەی هەستی مندا،
خۆی دەنواند
خۆشەویستم:





مەگری بۆ مەرگی دووبارە
سروودی خۆشەویستیەکان
لە دەسرەکانم وەربگرە
چاوم لێتە
تا ئەوانە،
ئەو دەسرانە،
لە سەر زامەکانی بە ناسۆری
لەشی هەزار پارچەی وڵاتەکەم،
ببەستییەوە

مەحموود دەروێش - وەرگێڕان١٣٦٣ -سەقز

ئەم وەرگێڕانە -دەسرەکان- لەو شیعرانەمە کە زۆر لە مێژە سەریان تێدا چووبوو.
ئەوەی لێرە هەیە تەنیا لە زەینی مندا مابووەوە و دڵنیا نیم کە تەواوی بێت.

# حەیات

نامەوێ شاخی نەبات و بۆ و بەرامەی عەنبەری
دارەکەی تووبایە بەژن و قامەتی دڵدارەکەم
نامەوێ ئاوی حەیات و شەهدی جامی کەوسەری
سەد حەیاتم پێ دەبەخشێ ، لەعلی لێوی یارەکەم

شیعری کۆن





# ئاو میوەگیری

بە درێژایی دیواری چین
چاوەڕوانیمان کێشاوە
بەڵام نە ئیمەیڵ و نە فۆن
لە جەنابتۆ لێنەدراوە

بەڵێنمان بوو بۆ سەروپێ
تەشریف بێنی لەگەڵ "شەمێ"
کەچی ئەوا لە سەر دڵمان
ئەمەش بووە بە وەرهەمێ

سێ مانگە لە نێو یەخەچاڵ
دامان ناوە کەللەوپاچە
هەر بە هیوای جەنابتین تا
خۆ بدەین لەو سەروقاچە

هە واڵم پرسیت لە "شەمێ"
فەرمووی کە من هەر نایگەمێ
بە وێنەی ئاومیوەگیری
دەمژێ بەی و سێو و هەرمێ

بیست و چوار کاژێر لە ماڵە
هەتا بفەرمووی سەرقاڵە



خەریکی گرتنی ئاوی ،
قۆخ و لیمۆ و پرتەقاڵە

دیارە لە م هەموو ئاو میوە
خێر و بێری زۆری دیوە
بۆیە هەر وەک مشکە کوێرە
خۆی حەشار داوە لەو شیوە

زستان تەواو بوو بەهار هات
ئێستاش بەرەو هاوین دەچین
تازە زانیومانە کە تۆ
دڵت دۆڕاندووە بە چین

ئا بەم بار و شێوە و فەرمە
ئا لەم هەل و مەرجە نەرمە
چاوەڕوانی بێسوودە ، چون
سەر و بەر هەردووکی گەرمە

ئەی برای هێژای پاچەخواز
مامۆستای کارەبای سێ فاز
هەر کە پاچەی ئەسڵت دەسکەوت
لە ڕاپەوە چووی بەرەو جاز

ئێستاش بەڵکوو بە "ئیمەیڵێ"
نیشان بدەی وردەمەیلێ



له بۆ خاتری دۆستیمان
ساتێ واز بێنی له لەیلێ

له پاش ئەوەی چوار مانگ بووی "لەیت"
دڵت بێ و جێ بێڵه "ڕوومەیت"
تۆزێ ئاگات له خۆت بێت و
لەوه زیاتر "لووز" مەکه "وەیت"



دەترسین نەتناسینەوه
پاش ئەو هەموو "ئێگزێڕسایزه"
لەشت ناسک بوویێتەوه
هەروەکوو "ژۆرژێت" و "کایزه"

دیاره مافی ڕەوای خۆته
دوای ئەو هەموو بەند و کۆته
هێنده بگری "دووش" و "شاور"
پێت ڕانەگا خاولی و فۆته

بەڵام ئێمەش نیگەرانین
قەدری جەنابت دەزانین
بۆیه له پاش سێ چوار مانگیش
هێشتاکوو هەر چاوەڕوانین

بۆوەی که "بووستێ" وەربگری
سەروپێت نەچێ له خەیاڵ

فیشەکدانت سەرپڕ بکە و
خێرا ڕێکەوە بەرەو ماڵ

ئەوسا بە دەسترێژ و ڕەگبار
هێرش ببە بۆ شۆخی چین
دیسان بیووژێنەرەوە
داستانی عەشقی "مەم و زین"

ئۆتاوا -١٦ی مەی ٢٠٠٨
٢٦ی بانەمەڕی ٢٧٠٨

لە هەجوی هەڤاڵێکی خۆشەویستدا پاش
ئەوەی ماوەیەکی فرە بێ ژن مابوویەوە و بۆ ژنی دووهەم دەگەڕا.



**بۆ فێستیڤاڵی باڵاپۆشی ناوچەی پشدەر، لە لایەن کۆمەڵی دادگەری ئیسلامی لە باشوور، بە دروشمی ( باڵاپۆشیم شکۆیە ) جۆزەردانی ٢٧٢١**



**فیلمی سووتاوی باڵاپۆشان**




فێستیڤاڵ و کۆبوونەوە و
هەرا و بگرەی
باڵا پۆشتان ،
نە شانازی و ،
نە شکۆیە
بەڵکوو هەموو ،
نواندنە و
سەرپاکی فێڵ و
دهۆیە
ئەوەی ئێوە دایدەپۆشن
نەوەک باڵا ،
بەڵکوو هزری کونجکۆڵ و
مێشکی پڕ لەپرس و جۆیە
دەک دارزێ و
دەک داوەشێ
ئەو دەسەڵاتە گەندەڵەی
کە دوای پتر لە سی ساڵان
ژەنگاوی بیری کرمۆڵی
بەری پووچەڵی وەک ،
تۆیە !



جۆزەردانی ٢٧٢١ ، ئۆتاوا



# شنۆی ئازادی

نەورۆزەن وەرزەن وادەن بۆ شادی

گوڵپۆشەن سارا و کۆسار و وادی

مەل و شەتاو و سەوزە و گوڵ جەمەن

بەڵام نەدیارەن شنۆی ئازادی





# حوجرەبیری

باشوور...
تەواو پەک خراوی
چیتر وەکوو خۆت نەماوی
پەنجات دۆڕا و
پەنجات گۆڕا و
بوویتە موڵک و تاپۆی ڕەنگ و حیزب
و گرد و،
زۆن و میری
نە هەولێرت "قەڵا" ماوە و
نە سلێمانیت،
"پایتەختی ڕۆشنبیری " !
ئەوەی ئەورۆ بەچاو دیارە
گەڕانەوەی تاڵی هزرە
بەرەو دیاردەی
سەدەکانی
"حوجرەبیری"

**ئۆتاوا - پووشپەڕی ٢٧٢١**

حوجرەبیری: medievalism هزری سەدەکانی ناوەڕاست، (قرون وسطایی)، دەستەواژەیەکە، کە خۆم دامناوە بەرانبەر بە ڕۆشنبیری.




# خاكفـــــــرۆش

به سەرجەمی پەڕەكانی مێژووی كوردا
كه بڕوانی
بەسەدان و

به هەزاران كارەساتی

ڕاپەڕاند و
هیچكاتێ نسكۆی
نەهانی
هاوشان لەگەڵ شاخەكانی
بەرز مایەوه و
قەت كز نەبوو باهۆ و
شانی
بەرەو ژوانی سەربەخۆیی
هەنگاو هەنگاو



گەشایەوە
لەسای خوێنی
ڕۆڵەکانی
هەر مایەوە،
هەر مایەوە
بە هیچ قەڵاچۆ و پیلانێ
بەرگەی گرت و
نەتوایەوە
کارەسات لە دوای کارەسات
لە لووتکەی ئاوات و هیوا
دیسانەوە و دیسانەوە
سەری بەرزی،
هەڵدایەوە
بەڵام ئەورۆ...
لە نێو جەرگی هەزارپارەی نیشتمانم
تاعوونێ سەری هەڵداوە
گەلێ دزێوتر لە ئەنفال
ڕەشتر لە چی کارەساتە
لەم نیشتمانە
قەوماوە
ئەورۆ بە پانتایی وڵات
ڕەوتێ سەری دەرهێناوە و،









به تواندنەوەی "خۆ" خەریکە
ئەرکی جیرانی لە ئەستۆ و،
لەبری ئەوان،
سەرقاڵی "**تەعریب**" و "**تەفریس**" و "**تەتریکە**"...
هاوکات لەگەڵ ئەم دیاردەیە
کۆمەڵگا دەستەوەستانە
ئەندێشەی زەن دلۆرەیە
هزری ڕزگای
فەریکە
زمان چەمکێ تێکەڵاوە!
کولتوور...
هەر باوی نەماوە!
سەربەخۆیی وشەی نامۆ و
یەکجێ لە قامووس تۆراوە
لەبری ئازادی و نیشتمان
دیاردەی تەنوای "خاکفرۆشی"
لە نێو ئەم ڕەوتەدا
باوە
سەیری هەر پارچەیەک دەکەی
"ناکورد" لمۆزی تێناوە
بێت و "بیر و بیراز" نەبێ
بێت و بیر و بیراز نەبێ...



زۆر دوور نییە
کورد لە زێدی باپیرانی
کەمینەیەکی،
دۆڕاوە...

ئۆتاوا - ١٤ی پووشپەڕی ٢٧٢١

**تێبینی:**

ماوەیەکە دیاردەیەک سەری هەڵداوە لە باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان، جەماعەتی عەرەب و تورک و فارس ڕژاونەتە ئەو دوو پارچە و لە زۆر شوێنان خەریکی کڕینی موڵک و زەوی و زاری کوردن. هەر لە زەمینی کێڵان و کەشاوەرزی هەتا ماڵ و خانوو...
بە بڕوای من ئەم ڕەوتە شتێکی بەهەڵکەوت نییە و زۆر لەوە دەچێ کە پڕۆژەیەکی هاوبەش و دارشتەی حکوومەتەکانی ئێران و تورکیە و عێراق بێت بە مەبەستی گۆڕانی دێمۆگرافیای کوردستان بە گشتی. نموونەی ئەم کارانە پێشتر لەو وڵاتانە هەبووە و هەموو ئەوانە بە بەڵگەوە لەبەر چاومانن. ئەم ڕەوتەش کە ئەم ماوە لە کورستاندا سەری هەڵداوە، درێژەی هەمان ئاسمیلاسیۆن و تواندنەوەیە کە بەداخەوە دەستی کۆمەڵێ بەرچاو، فرۆشیاری کوردی تێدایە.

ئۆتاوا - ١٤ی پووشپەڕی ٢٧٢١

# گیانی دڵ

ئازاری مەدە دڵێ کە تۆ گیانی بی

نەدیار و دیار ئۆگر و میوانی بی

ترسم لەویە لە سۆنگەی ئەو ئازارە

بتوێتەوە دڵ، ئەتۆش لە نێوانی بی

حەسەن شافیعی. ئۆتاوا

٨ی سەرماوەزی ٢٧٢١

نازار دلی را کە تو جانش باشی

معشوقە پیدا و نهانش باشی

زان می‌ترسم کە از دلازاری تو

دل خون شود و تو در میانش باشی

"ابوسعید ابوالخیر"



# بۆ دادە سەروەت

کۆچەرێ دیسان هەواری بردەوە بۆ خاک و گڵ
"سەروەت"ێ ڕۆیی کە یاد و کۆچی ناسۆرە لە دڵ
ژیلەمۆیە، نامرێ، پۆلووی تەش و نێڵەی کڵە
شەونمی پەلک و تنۆکی سەر پەڕەی هەرچی دڵە

بۆ ئامۆزاژن و خوشکی قەت لەبیر نەچووم دادە سەروەت مەزهەر

ئۆتاوا، ١٨ی سەرماوەزی ٢٧٢١

# تف

چۆن لە ڕووتان دێ کە باسی ژین و شادیمان ئەکەن!
چنگ بە خوێن و بانگەشەی دادی خودا و ئیمان ئەکەن!
هەرچی نەشیاوە نەما نەیکەن لە سۆنگەی خواکەتان
تف لە دەرگانەی، کە بەشقی ڕۆژ و شەو تاوان ئەکەن

ئۆتاوا، بەفرانباری ٢٧٢١

به چه رویی سخن از شادی ما میگویید!
دستتان خونی و از عدل خدا میگویید!
چه غلطها که نکردید پس پرده دین
تف به درگاه خدایی که شما میگویید

(سەیید موحەمەدڕەزای کوردستانی)

ناسراو بە میرزادەی عیشقی





# تەختەنەرد

ئاسمان تەختەیە، ئەستێرە هەموو مۆرەگەلی
قورِنەکان هەیڤ و هەتاو ، یاریکەریش گەردوونە
تەک وەها تاس و وەها کۆنە حەریفێ فرەزان
بردنەوە، هزری کول وکاڵە،
بە لارِێ چوونە
کاکڵی کارەکە "هات"ە بە سەرت، نەک زانست
نیشتنی تاس بە حەز، خەونە، نە وەستا بوونە!

ئۆتاوا، بەفرانباری ٢٧٢١



# خۆشم دەوێی

تاسەی ئەو دەمەم کردووە
کە خۆشەویستی پاوان بوو
بەر دەرگاکەی ماڵەکەتان
بۆ من وەک ماڵەباوان بوو
ئێستا گەلێ فراوانتر
لەو سەردەمە خۆشم دەوێی
بۆ هەر شوێنێ چاوم بڕ کا
وێنەی تۆیە و تۆ هەر لەوێی

ئۆتاوا، بەفرانباری ٢٧٢١



# یاسا

لە هەر شوێنێ لەم دنیایە
منداڵتان دی
لە سەر شەقام،
دنیای منداڵیی فرۆشی
بۆ مانەوە،
شیلەی ژیان و
گیانی دۆشی
خەمی تەنیا خەمی نانە!
باش بزانن لەو وڵاتە
ڕێسا و دین و ئایدیالۆژی
هەموو ڤایرۆسی کۆمەڵگا و
یاسا،
هەر پارە و
گیرفانە!

ئۆتاوا, بەفرانباری ٢٧٢١



# خوانی مەلا

سێ شتن قەت نایەنە دیتن بە بێ ئەملاولا

چاوی مێروو، و لاقی مار و چوونە سەر سفرەی مەلا

ئۆتاوا، بەفرانباری ٢٧٢١

وەرگرتن لە:

(چشم مور و پای مار و نان ملا را کە دید)؟!






# زێڕ و ڕێز

قەدیم "زارا"یەکمان هەبوو
کەپۆی،
هەوا دایگرتبوو
ژاوەبێژ و
گارانی بوو
حەزی لە وشەی بێگانە و
ئاخافتنی،
تارانی بوو

چون پێی وابوو
زێڕی زۆرە
بەڵام "زارا"کەی ئەمڕۆمان
کوردیوێژ و کوردیزان و
ژیر و لێزان و
پسپۆڕە
هەتا بڵێی
خۆشەویستە و
لە جیاتی "زێڕ"،
"ڕێز"ی زۆرە...

ئۆتاوا، بەفرانباری ٢٧٢١
بۆ زارا موحەممەدی



# کۆڵبەر

له هەگبەی هەر،
ڕێبوارێکی ئەو تەلانە
پڕ،
هەوڵی ئازادی و نانە
پڕ،
گەورەیی و کۆڵنەدانە
پڕ،
خۆشەویستی مرۆڤ و
پڕ،
ئەوینی نیشتمانە...
کۆڵبەر،
لووتکەی شەرافەتە
ترۆپک و
دوندی ویژدانە
کۆڵی شاخە و
بیری وردە
هێمای پاکژی مرۆڤ و
شانازی،
چل ملوێن کوردە...

ئۆتاوا، ڕێبەندانی ٢٧٢١



کۆڵبەر

لە هەگبەی هەر
ڕێبوارێکی ئەو تەلانە
پڕ
هەوڵی ئازادی و نانە
پڕ
گەورەیی و کۆڵنەدانە
پڕ
خۆشەویستی مرۆڤ و
پڕ
ئەوینی نیشتمانە...
کۆڵبەر
لووتکەی شەرافەتە
ترۆپک و
دوندی ویژدانە
کۆڵی شاخە و
بیری وردە
هێمای پاکژی مرۆڤ و
شانازی،
چل ملوێن کوردە...

حەسەن شافیعی، ئۆتاوا
ڕێبەندانی ٢٧٢١

# داوەڵ

چیتان لە پێتەختتا دیوە؟
پشت لە گەل و
ڕوو لە بەغداد
ڕووگەتان بۆچی گۆڕیوە!؟
بە شوێن چیدا وێڵە سەری
هەڵۆڵ و نزمۆکە و
شۆڕتان
لەو نیشتمانە سووتاوە
بۆ ناگەڕێن؟!
بۆ نارۆن و،
ون کەن گۆڕتان!
ئەو کەلاوەی،
نێوی فیدراڵتان لێناوە
چ نانێکی بە کورد داوە؟
دڵتان خۆشە بە داوەڵێ!!
بۆ سەرکۆماری وڵاتێ
کە هەر،
قاپووڕەکەی ماوە!!
ئەوەی ئێوە لەدوای وێڵن
هیچ نێومالێ،
دارێژ ناکا
سەد هەراسەی بێدەسەڵاتیش بنێرن
زامێکی کورد،

سارِێژ ناکا

نەک سەرۆک،

ئێوە زبڵیش نین

چی سامانی ئەم خاکەیە

بۆ لق و چڵ،

پاوان ئەکەن

خۆڵ دەکەنە چاوی گەل و

پشت،

لە ماڵەباوان ئەکەن!





سەرۆکی کورد
ئەو مرۆڤە مەزنانەن
کە بۆ شان و کەرامەتیان
لە سەر سفرە و،
خوانی بەتاڵ
بژاری دەرد و ژان ئەکەن
باس، باسی ئازادی و
نانە
باسی حورمەتی ئینسانە
باسی گەشە و سەربەخۆیی و
کەرامەتی،
کوردستانە
سەرۆکی کورد
کۆڵبەرێکە
کە کۆڵەپشتەکەی شانی
سەنگی هەموو،
سەری ڕەش و
دەباشانە
سەرۆکی کورد
ئەو ئافرەتە نازدارانەن
هەموو ڕۆژێ
لە ژێر حوکمی ئێوەی گەمژە
لەشیان پۆلووی،
ئاگردانە

بۆ ملی خۆتان ناشکێنن
بەرەو عەنقەرە و بەغدا و
قوم
خۆ ئێوە چاوبەستی چاکن
دزی هەرد و ئاو و
خاکن
گەلێ سانایە بۆ ئێوە
کلکە سووتێ و
ماچی پێڵاو
باش ڕاهاتوون ماسی بگرن
لە شوێنی لیخن و
لێڵاو
دە واز بێنن
دە واز بێنن
ملتان بشکێنن و بڕۆن
لێگەڕێن لەم نیشتمانە
شوێنی ئێوە
دەرگاوانی
شاریع ڕەشید و چانکایا و
ئاودەستەکەی،
جەمارانە

ئۆتاوا، ڕێبەندانی ٢٧٢١



# شنیار

باشوور...
"قەسابخانەی سەردەم"
لە پاش سێ دەیە "ئازادی"!؟
بۆ دەبێ وا،
پێناسەت کەم؟
هەموو ڕۆژێ یەکەم وێنە
کە دێتە پێش،
ئەم دوو چاوە
دیمەنی ئافرەتی کوردە
بۆتە قەقنەس و
سووتاوە
یا لەشێ
ئەنجن ئەنجنە و
لە خوێنی ڕقا،
گەوزاوە...
هەتا کەی دەستەوەستانی؟
بۆ تێکی نادەی ئەم ڕێسای
گورگ  و مەڕە
سەدان "شنیار"

بوونە قۆچ و
کەچی هێشتا
چاوی کۆمەڵگاکەت کوێر و
گوێی دەسەڵاتیشت،
کەڕە...

ئۆتاوا، ڕەشەمەی ٢٧٢١

## ئاڕەفتە

خانە نشین و پیر و ئاڕەفتە
لە بازنەی داوی کۆڕۆنا کەفتە
بە سۆشیال میدیا و چەت و چەقەچەق
سەرمان قاڵ بووگە حەو ڕۆژی حەفتە

ئۆتاوا، ٢٣ی بەفرانباری ٢٧٢١

# كوردانه

کوردێ کە فارسی لە لای شەکەرە
تورکی و عەرەبی بۆی تاجی سەرە
لە گەنجی وێژەی خۆی بێ خەبەرە
دابی بێگانەی لە لا هونەرە
کوانێ نیشتمان پێویستی پێیە
ئەوە کورد نییە، هژمە و نۆکەرە

کوردێ نەبێژێ بە زاری کوردی
کوردانە نەبێت ئەندێشە و کردی
خۆی بە کەم دانێ و برمێنێ پردی
ژێر دەستی ناخۆ و، بێت بە شاگردی
کوانێ نیشتمان پێویستی پێیە!
با ون بێ و بڕوات بە ئەستۆی وردی

ئۆتاوا، خەزەڵوەری ٢٧٢١

(لە مەراقی کۆمەڵێ کوردی بە زمانی خۆ نەنووس و خۆ بەکەمزاندا.)

# قانیع و من

ئەمساڵ عەوداڵی پار و پێرارن
تەخەڕوجەکان زۆربەی بێکارن
حەڵاڵ خۆرەکان زۆربەی هەژارن
ماستاوچی و چەتەش خاوەن تەلارن

" قانێع "

# بۆ قانێع

قانیعا ئەمڕۆش هەژار موبتەڵان
دز و ماستاوچی، بازاڕ و مەڵان
سیاسیی و سەرۆک نۆکەری گەڵان
زانا و لێهاتووش هەر تووشی بەڵان

" حەسەن شافێعی "



# هۆزان

لەم جیهانە چی دەبینم هەر مژە و دوومان و هاڵ
گوێ نەبیس و چاو نەبین و مێشک وەک تەپڵی بەتاڵ

ئەقڵ حەیرانە لە سۆنگەی هزری کۆڵ و خاو و کاڵ!
خەونی ئازادی، گەلێ هۆزان و گەورەی نایە چاڵ!!

ئۆتاوا، خاکەلێوەی ٢٧٢٢



# جیاوازی

چ ئازارێکی بە سۆیە
چ ڕۆژەڤێکی تاڵ و ژاڵ
لەولا گوێی دنیایان کەڕ کرد
بە پڕوپاگەندا و
قرم و قاڵ
چونکە پێستی سپی ڕووشا و
تەم نیشت
لە چاوی شین و
کاڵ...

بەڵام لەملا...
سێسەدهەزار زیندە بەچاڵ
پێنجهەزار جەستەی بە زووخاڵ
چەند هەزار گوند و مەزرا و ماڵ
بە ملوێنان پیر و منداڵ
پەیتا پەیتا ئایەی ئەنفاڵ
هەزاران کارەساتی تاڵ

بەسەر کوردا هات و دنیا
کوێر و کەڕ و
دەبەنگ و لاڵ...

ئۆتاوا، ٢٠ی ڕەشەمەی ٢٧٢١



# بیست و حەوت

بیست و حەوت ساڵە من هاوکەمپی تۆم
هەر چی دەفەرمووی، وەک ئایەتە بۆم
بۆوەی تۆ شاد بی، من هەر خەم دەخۆم
هاودەردی "شەمێ" و دیلی دەستی تۆم
خۆت لە بەستێنا و من، لە قەعری گۆم
باش ئاگام لێتە لە کەمپ و لە چۆم
مەشرووب و سیگار، مەزە و تام و تۆم
هەمووی دەهێنم لە سەر خەرجی خۆم
بەشقی ڕفاقەت دەسووتێم وەک مۆم
چۆنە کە ئێستا وەها ڕەنجەڕۆم
گوناحم چی بوو، بۆ دوو قل سیگار
پەڕیوەت کردم لە کەمپ و لە شار !

ئەم هەموو ساڵە هیچت نەفەرموو!!
هەتا بیست و حەوت ڕۆیی و بە سەرچوو
بەڵام ئاخری لە پلەت دەرچوو

کردت لە مۆمی دۆستایەتی فوو
دەتکێشا سیگار، دەتترووکاند توو
خۆت نەشڵەژاند و بە بێ یەک و دوو
زیندووت کردەوە قەرزێکی مردوو
هیچ پێویست نەبوو ئەوەی تۆ کردوو
گوناهم چی بوو بۆ دوو قل سیگار
بێزارت کردم، بوومە گاڵتەجاڕ!

لەم حاڵە کە من وا سڕ و پۆکم
کاکڵم پووک و هەر تەنیا تۆکم
هێشتا بیئاگا و هەر لە سەر هۆکم
وەها هەست ئەکەم بێ ناوەرۆکم
هێندە بێ هیوام دەڵێی نەزۆکم
لەگەڵ فەرموودەت،خەیلێ ناکۆکم
بیست و حەوتی دیش هێشتا هەر شۆکم
بۆیە ئێستاکەش هەر لەسەر چۆکم
گوناحم چی بوو بۆ دوو قل سیگار
پەڕیوەت کردم، لەکەمپ و لە شار
دوو ڕدێن سپی لەگەڵتا دووان

له چاوی منۆ هەردووکیان سووان
داوایان لێت کرد کە بێیتە ژووان
هێندەیان پێت وت مووی دەرکرد زووان
لە دڵڕەقیی تۆ هەردووکیان پووان
بەڵام پشت گوێت خست داوای هەر دووان
هەلیّ زێڕینت لە دەس خۆت چووان
واتای "ڤیرسیچمە"ت بە باشی نووان
گوناحم چی بوو بۆ دوو قل سیگار
بێزارت کردم لە کەمپ و لە شار !

با ئیتر بەس بیّ ، ڕەوتی لارەلار
تا مقاش هەیە، بە دەس مەگرە مار
هێندە مەگێڕە فەرتەنە و قومار
چیتر جیڕ مەبە لە شێوەی گوفتار
لە کەلی شەیتان تەشریف بێنە خوار
یەک وشەی زێڕین دەر بکە لە زار
چی کەڵکەڵەیە، با ببێت قوتار
نەمێنیّ چیتر، بۆڵە و گارەگار

گوناهم چی بوو بۆ دوو قل سیگار
بێزارت کردم، بوومە گاڵتەجاڕ

ئۆتاوا، هاوینی ٢٧٢١

جەفەنگێکی نێوان دۆستان، کە من بڕێ ترش و خوێم پێدا کردوە.

# هەناسە

هەناسەیەکم هەڵکێشا و
ڕۆچووم لە ناخی ڕابردووم
هاتم بێژم خۆزگەم بە ...!
بەڵام دیم لە مێژە مردووم
چون هەرچی ئاوڕم داوە،
لە خۆمی لانەوازی کورد
تا شەست و حەوتی ژیانم
ڕۆژێکی خۆشم شک نەبرد

ئۆتاوا، بەفرانباری ٢٧٢١

# سی و چوار ساڵە

سی و چوار ساڵە
گەل چاوەڕێ و
وادەکانی داوەڵەکان
وەک مێشکی خۆیان،
بەتاڵن
سی و چوار ساڵە
نیشتمان هەڵدەپڕووزێت و
هەراسەکانی دەسەڵات
هەروا،
نەبرژاو و
کاڵن
سی و چوار ساڵە
لە گوێن مێژووی خوێناویمان
بۆ وەڵامێ...
کەڕ و کوێر و
لاڵی لاڵن
عالەم گوستی خۆ دەگەزن!
چۆناوچۆنە نەتەوەیەک

سەد و هەشتاو دوو هەزاری قەڵاچۆ بێ و

کەچی هێشتا کڕ و سڕی

ئایەی نگریسی،

ئەنفالن؟!

ئۆتاوا, خاکەلێوەی ٢٧٢٢



# کەواسوور

دیسان خوێنی نیشتمانی نەحەساوە

کرایە نێو جام و

پەرداخ

دیسان زەردی کەواسوورمان

کەوتە گەڕ و

بۆ داگیرکەر

بوو بە چاو ساخ

دیسان زۆڵەکی ئاشی کورد

بوو بە کەمتیاری "ڕۆژ" و

بۆ یەک بزەی،

سوڵتانی تورک

کەڵپەی،

چەقاندە جەرگی شاخ

هەموو لەشی نیشتمانم

پڕی زامە و،

دەزریکێنێ

کوا وزە و ورەی کوردانە!

کوا ڕۆڵەی ڕۆژی تەنگانە!

تا کوردستان پاکژ بکات

له زۆڵەکورد و
بێگانە !...

ئۆتاوا, ٣٠ خاکەلێوەی ٢٧٢٢

به بۆنەی پەیمانی نەگریسی "سەری ڕەش" و "چانکایا"

# شــەق

بشکێ ئەو دەستەی تۆ دەیشەکێنی
سەرشۆڕی زێدە بۆ هۆزت دێنی

گەلی کورد هیچکات لە بیری ناکا
ئەو خەیانەتەی تۆ پێکی دێنی

شەقلێکی پیست دا لە مێژووی کورد
بەم ئیشە ئاوی ڕووی نەبووی خۆت برد

کورد هەر سەربەرزە ونوێنەری وەک تۆ
بە شەق دەخاتە مەیدان وەکوو گۆ

ئۆتاوا, گولانی ٢٧٢٢

بۆ تەوقەکەی بنکردەکانی سەری ڕەش، لەگەڵ ئەردۆغانی فاشیستدا

# هەواری تاسە

شەو لە نیوەیە و من هەر بێدارم
هەر دەتلێمەوە و هەر تاسەبارم

خەونی ئازادی و بینینەوەی زێد
بۆم بۆتە تەنیا ترووسکەی ئومێد

تاقەت نەماوە، پڕووکا سەبرم
بێ هیوا لە ژین، لە ڕۆخی قەبرم

چی خۆشەویست بوو لە لانەی دڵدا
جێیان هێشتم و لە خانەی گڵدا...

چاوەڕێی منی هیوا بڕاون
نیشانەی دیدەی دایم پڕاون

گەلێ خاڵییە هەواری تاسەم
لە ژمارایە دەم و هەناسەم

لێورێژە پەرداخ، دڵم زۆر پڕە
هەناوم مەکۆی بڵێسە و گڕە

سووتام لە تەشقی کوورەی تەنیایی
چیتر ناگرم بەرگەی جودایی

نیوەشەوی ٢٧ی گوڵان ٢٧٢٢



# شێخ و ئەسپ و سێو

لە شیویکدا کە مۆڵگەی زائیران بوو
هەبوو شێخێکی مێر منداڵ و خۆشڕوو

لە سۆنگەی خۆشەویستیی باب و منداڵ
درابوو پێی بە دیاریی یەک جوانوو

بە وێنجەی تەڕ، بەسێوی سووری سەرشیو
هەموو ڕۆژێ لە خزمەت ئەسپەکەی بوو

ئەوەندەی سێو بە خوردی دابوو شێخمان
تەنانەت ناوی سێو فێر بووبوو جوانوو

بەڵام قەوما ئەوەی نەبوا بقەومێ
لە مێرشێخمان، بە یەک داب و بیانوو

ئەوەش، ڕۆژێ بە میوانیی ، زەلامێ
وەژوور کەوت و بووە حەشر و هەیاهوو

لە بۆ یەک هەفتە میوان خێوەتی خست
بە سەیری ئەسپەکەی شێخمان خەنی بوو

دڵی چووبوو لە جوانووی شێخی بێبەخت
بە دابی وێ درا پێی و لە دەست چوو

کە شێخ زانی بەمە شینی لە بۆ کرد
بەڵام شین و چەمەر ڕۆیی بە یەک فوو

گەلێ خەمبار بوو شێخ بەم کارەساتە
شەو و ڕۆژ تێپەڕی و شێخ هەر هەتەر بوو

زەمەن هات و زەمەن ڕۆیی و زەمەن چوو
بەڵام شێخ ئەو مەراقەی هەر لە دڵ بوو

له پاش چەن ساڵ کەشێخ ڕۆژێ له چەم بوو
له پڕ دەنگێکی بیست زۆر ئاشنا بوو

که باش چاوی هەڵێنا ، واقی وڕ ما
لەوەی دیتیی و لەوەی بیستیی و لەوەی چوو

به زاریی ڕووبەڕووی شێخ دەیحلیکاند
له سەر پاشوو ، له دوورۆ کۆنه جوانوو

به حیلکەی تایبەتی شێخی سەڵا دا
که شێخ: کوا سێوەکەم، کوا سێوەکەم، کوو...

ئۆتاوا، خاکەلێوەی ٢٧٢٠

له سەر گێڕانەوەی شێخزاتێ
که ئەسپەکەی فێری خواردنی سێو کردبوو.





# ئاگاداریی

هەر دۆستێ نەبێ تەک من سینە ساف
بێبەزەییانە بۆی دێمە مەساف

یا بە قسەی "بەکرۆک" دڵی لێم بێشێ
بە چەکی شیعر لێی دێمە پێشێ

شل شل دەیشێلم دەیکوتم بە دڵ
وا کە تا مابێ لە من بکا سڵ

کە وابوو ئاگاو لە خۆ بێ گیانە
دەنا شڕ دبی بە کەترە و تانە

ئۆتاوا، جۆزەردانی ٢٧٢٢

# بۆ: ئامینەی کاکەباوە

لە باژێڕی،
دهۆ و فێڵی ڕۆژاوادا
شۆڕەتەوارێکی چەلەنگ
سەری هەڵدا و
ئەشقیا بوو
گەشەی کرد و
لە تەوێڵی تاکی کوردا
پشکووت و بوو
بە تاج و سەنگ
تاک و تەنیا
بوو بە وانەی بەرخۆدان و
بوو بە ورە و دروشم و،
دەنگ
بۆ سەرفرازیی نەتەوەی
شنایەوە و
بوو بە ڕەمزی ئازایەتیی و
بوو بە شەقڵ و
هێما و،
بەرژەنگ...

ئۆتاوا، ١٦ی جۆزەردانی ٢٧٢٢

# جەوانیی

پیرم و لاوێنیی دەغڵ و گیشەمە
ژوان و دڵداریی لک و پۆ و ڕیشەمە
پیریی بەو لاوە، چما دەسکەوتە دەم
تاکوو دەم مابێ، جەوانیی پیشەمە

وەرگێڕان، ئۆتاوا، جۆزەردانی ٢٧٢٢

من به پیری هم جوانی می کنم
عشق ها با زندگانی می کنم
دم غنیمت دانم، ای پیری برو
تا نفس دارم جوانی می کنم

مهدی سهیلی






# جووتی جەفا

نابینم ئیتر دڵێ کانی وەفا
خۆشەیستیی چوو، ئەما چیتر سەفا
دەور و بەر تار و تەمە، بزرە بزە
شەشدەری هیوای تەنییم جووتی جەفا

ئۆتاوا، جۆزەردانی ٢٧٢٢

وەرگرتن لە: ( مرا دردیست اندر دل اگر گویم زبان سوزد).

# نەوت و نەتەوە

مستەفا چاوڕەش، هێمن هەورامی
تێپەڕی دەوری دهۆ و کاڵفامی

گەل بەلەنگازە، بەڵام وریایە
چەواشە چیتر نەماوە تامی

خەڵک و پێشمەرگە، خاک دەپارێزن
نەک شتێک بۆوان نەبێ ئاکامی

ماڵبات و هۆز و میلیشیای خۆتان
بۆ نەوت با ببنە هێز و مەحامی

دۆلاری پێترۆل کۆشکە و بارەگا
کوا بۆ گەل خێر و بێر و ئەنجامی؟

داواتان لە گەل، بێ ئەخلاقییە
بەجێی بهێڵن بۆ "کاک" و "مام"ی

ئۆتاوا - پووشپەڕی ٢٧٢٢

لە سەر وتە بێتامەکانی مستەفا چاوڕەش و هێمن هەورامی.

# ئاهی پەنهان

لە دڵ ژانێکە گەر بێژم گڕی تێ بەردەبێ زمانم
حەشاریشی بدەم، یەکسەر دەسووتێ مۆخی ئێسقانم

ستارەی تالعم بێن و لە بورجی ئاسمان دەرکەن
سەما نەک هەڵپڕووزێنێ، بڵێسەی ئاهی پەنهانم

ئۆتاوا، پووشپەڕی ٢٧٢٢

وەرگرتن لە: ( مرا دردیست اندر دل اگر گویم زبان سوزد).



# ژیانەوە

دۆستان، هەڤالان، یارانی گیانی
با بە یەکدڵی و نەرم و نیانی

هەوڵمان، هیوامان، نویٚ بوونەوە بیٚ
پارێز لە دووری و، جویٚ بوونەوە بیٚ

فێر بین لە یەکدی، وانەی خۆشویستن
گوێی دڵمان ڕاگرین بۆ یەکتر بیستن

نەینۆکی یەک بین بە دڵ و بە دەم
لە ناخمان ڕادەین گەوارەی ماتەم

تێکرا هەوڵ بدەین لە ئاستی خۆمان
چون هەر هاوڕێبوون، ماوەتۆ بۆمان

خۆمان باوێینە نێو بازنەی یەکبوون
ببین بە گیانیٚ بۆ بەرەو پێشچوون



هەموو بەرابەر لە کار و لە ماف
کە باسیٚ پێش هات نەچینە سەر قاف



ئامانجمان تەنیا، خەم بەبادان بێ

خۆ لە باسگەلی سەقەت لادان بێ

کۆ بە خۆشبێژی و خەندە و مۆسیقا

هەڵبڕین لە ناخ، زایەڵەی قاقا

پیرۆزی بکەین هەر دەم یەکبوونمان

پڕ و زێدەتر، بێت هاتووچوونمان

دڵمان ئاوێنەی بێگەرد و غەش بێ

دۆستایەتیمان، لە سایەی گەش بێ

تێکۆشین تاکوو ببینە وانە

بۆ هەرچی کوردە، لەم هەندەرانە

ئۆتاوا، هاوینی ٢٧٢١

# ناتۆ

حەفتا و سێ ساڵ بەر لە ئێستا
کە تۆپەڵی شەڕ
هەڵدێرا
مێژوو،
دەورێکی دی گێڕا
گەلاڵەی گۆڤەندێکی نوێ
واژۆ کرا و
ئەمریکا،
بۆی بوو بە زاوا و
ئورووپاش،
بە بووکی برا
هەر ئەو ساڵە...
بوونەوەرێ بەدیهاتۆ
لە چەند دایک و
لە یەک تاتۆ
دەستی قەزا،
هەر دایکێک و
بەشێکی زا
پاشان بە چاودێری تاتۆ
گۆشیان کرد و
ڕێکیان خست و

**پڕچەک کرا و**

**بوو**

**بە "ناتۆ"...**

**ئۆتاوا، ١١ی گەلاوێژی ٢٧٢٢**




**تاتۆ: باوک**

**ناتۆ: ڕێکخراوەی پەیمانی ئاتلانتیکی باکوور**

North Atlantic Treaty Organization

# ئەمەل

وای دانێ فەلەک کۆکە لەگەڵ تۆ و ئەمەلت
سازە و بە دڵی تۆیە هەموو دەور و هەلت
چۆن ببنەوە کۆ ئەدی گەلی کۆنە هەوار !
چۆن بێتەوە گەڕ ئەو تەمەنەی چوو لە چەلت !

حەسەن شافێعی. ئۆتاوا، ٢٧ی گەلاوێژی ٢٧٢٢

**وەرگێڕانێکە لە سەر داوای هەڤاڵی هێژام**
**کاک مستەفای ئاسوور**

# امل

گیرم که فلک همدم و همراز آید
ناسازی دهر بر سر ساز آید
یاران موافق ز کجا جمع شوند
وین عمر گذشته ز کجا باز آید

**احمد خان فقیه**

# مەولەوی و من

ئامان هەی ئازیز، بینایی چاوان
گلەم جە تۆ هەس، خەیلێ فراوان
یانی چێش مەیلت فەرامۆش کەردەن
مەر بادەت نە جام بێ شەرتی وەردەن!

مەولەوی تاوەگۆزی



نە بادەم نە جام بێ شەرتی وەردەن
نە مەیلی دیدار فەرامۆش کەردەن
گلەت وەبان چەم بینایی دییەم
تاسەم هەر گەرمەن، قەت بێ شەرت نییەم
هەتاکوو جەستەم ڕۆح مێمانی بۆ
هەناسەم سەوزەن لە سای یادی تۆ

حەسەن شافێعی ، ٨ی جۆزەردانی ٢٧١٨، ئۆتاوا

# تێن

پڕ تاسەمە ، تۆ بەشقی شیعر بمدوێنە

مەڵبەندی جخارە دڵ ، هەناوم خوێنە

دەم دەم بە شنۆی پەلکی گوڵاڵەی چامەت

بارۆشە بکە کڵی تەشی ئەم تێنە

ئۆتاوا، گوڵانی ٢٧٢٠

بۆ هەڤاڵ و برای ئازیزم

کاک ڕەحیم لوقمانیی



# تەتە

دەور و بەر هەرچی دەنۆڕم ژانی ژین و حەسرەتە

کۆ پەڕاوێز و بڵاوە، گەل، هەموو بەشمەینەتە

کەس لە کەس ناپرسێ چۆنی! تاکەکان بوونە تەتە

تان و پۆی شیعرم لە تاوی ژانی تەنیایی لەتە

( بێکەسم، تەنیا ئەناڵم مەرگی خۆمم عەزرەتە)*

ئۆتاوا، گەلاوێژی ٢٧٢٢

(لە سەر بەندێکی مامۆستا هەردی)*



# سێ فەرماندە

"ژیان"،
شێری گۆڕەپان بوو
ڕەمزی ژین و
واتای مان بوو
وزەی سەرفرازی ژن و
قەڵای خارای،
بەرخۆدان بوو
جوانترین بووکی بێ تارای،
هەر چوار پارچەی
کوردستان بوو
زەماوەندی ژوانی لووتکە و
شایی و هەڵپەڕکێی،
هەرمان بوو
لە نێو گەرمەی شاییگێڕان
"بارین" چۆپی و
"ڕۆژ" گاڤانی،
هەڵپەڕکێی گەرمی
شەڕڤان بوو...

شۆڕە بووکانی بێ زاڤا
فەرماندەی ڕند و

دڵاڤا

خوێنی گەشتان بوو بە خەنەی

پەنجەی هەزاران تەواری

نۆبووکی حیجلەی،

ڕۆژاڤا

ئۆتاوا، ٤ی گەلاوێژی ٢٧٢٢

بۆ ژیان و بارین و ڕۆژ، ٣ شێرە فەرماندەی "ی پ ژ"، کە بە پیلانی چەپەڵی "ناتۆ" و درۆنی تورکی فاشیست، گیانی شیرینیان بۆ ئازادی بەخت کرد.



ژیان



بارین



ڕۆژ

# بۆ «ژینا»

له لووتكەی شاخی نەكەرۆز

بەرەو ئێڵاخی "هەرەبەرز"

تەوارێ دای لە شەقەی

باڵ

بەڵام لە پێدەشتی دینا

لە بۆسەی داڵی ئایینا

سووتا و سووتا و

بوو بە،

زووخاڵ

دەماوەن بوو،

بە كڵپەی شین

هەرد و ئاسمان چوون بە قینا

زاگرۆس،

بوو بە كڵی تۆڵە و

هەموو دنیا،

بوون،

بە "ژینا"...



**ئۆتاوا، ٢٦ی خەرمانانی ٢٧٢٢**




# هیچ

مرۆڤ گەر کۆیلە بوو، بوونی چییە؟هیچ!

کە ژین واتای نەما، چوونی چییە؟ هیچ!

هەواری نیشتمان ئاوا نەبێ، هیچ!

سەرێ ئازا نەژی و ئازا نەبێ، هیچ!

ئۆتاوا، ڕەزبەری ٢٧٢٢

# شۆڕشی «ژینا»

بوومەلەرزەی ڕاپەڕینە، زایەڵەی سەربەستی یە

ناوی "ژینا"، ڕەمزی یەکبوونە، هەوێنی هەستی یە

شۆڕشی پرچە، ژنە، ژیانە، دەمی ئازادی یە

ژیلەمۆ و گڕکانی گیانی ڕۆڵەکانی "مادی"یە

ژن کە ڕەمزی ژین و مانە، چاوگەی ئەم زۆخەیە

ڕێبەر و پێشەنگی زەنگی ئەم هەوار و دۆخەیە

ڕۆژی تۆڵە و خوێن و ڕاسانە، دەبا بشکێ ئەوەی

شەقڵی بێدەنگیی لە زارە، ون نەبێ خوێنی نەوەی

وا ڕچە شکاوە بە تاڵی تیغی شاڵ و زوڵفی ژن

دەرفەتە بۆ ڕاپەڕینێ، پڕ لە شانازی و مەزن

ژوانگە چۆڵ و، چاوەڕێیە بووکی ئازادی لەوێ

تاکوو گەل ڕابێ و لە خەرمان لۆخی ژینی بەرکەوێ

ئۆتاوا، ٣ی ڕەزبەری ٣٧٢٢

پێشکەشە بە ڕاپەڕینی مەزنی «ژینا»



# هیوا

چۆن شیعری تەڕم بۆ بێ کاتێ کە پڕی ژانم!
کاتێ کە هەر ئەکوڵێم و چەشنی گڕ و گڕکانم

تەڕلان و هەڵۆی زێدم، یەخسیری تەم و سۆڵە!
دڵ چڕ لە حەزی مان و سەر پڕ لە تەزی تۆڵە

ئاسۆی دەشە خەونی من، هێمان گەش و ڕووناکە
سەربەستی لە بۆ کورد و سەرسەوزی لە بۆ خاکە

"هیوا"یە کە دەمهێڵێ، "ئازادی" یە پێگەی من
"ژین" ئایەتی ڕاسان و "ژن" هاوەڵی ڕێگەی من

ئۆتاوا، ١٦ی ڕەزبەری ٢٧٢٢

# پرسیار؟

کەرکووک

پارێزگای عێراق بێ و

هەولێر و دهۆک،

عوسمانیی

سلێمانییش کە ئێران بێ و

مڵەی دەسەڵاتی ناوخۆ،

ڕەقەسەلەفیی و

ئیخوانیی!

دەی خاڵە باشوور پێم بڵێ:

تۆ کام پارچەی

کوردستانی؟!

ئۆتاوا، ڕەزبەری ٢٧٢٢

# تەشە

کە چاو لە عومری بێ چەش و
کە سەیری ژانی ژین ئەکەم
هەموو هەناسە ژاڵە خەستەکانی ئەم
شنە
بە من دەڵێن:
کە باڵی زاڵی داڵی کۆچ
شەقەی پەڕی،
لە سەر غەوارە هەیکەل و،
تووانەوەی تەشەی
منە
چ دارەتێکی گورچووبڕ
چ بێدەمار و،
دوژمنە!
چ بێقەرار و گورج و لەز
پەلەی تەمەن
بەرەو زناری کۆچەریی و
بەرەو بناری،
مردنە...
بەڵام چ خاوە خەونی چاو!
بەڵام چ خاوە خەونی چاو!...

چونک دڵم،
تەنووری ئاگر و
ئومێد
وە مەشخەڵانی پڕ لە تین
بە شۆڕشی زەنی
ژنە...

ئۆتاوا، ٢٥ی گەڵارێزانی ٢٧٢٢

## ئەشە و تابشتی

**سیامەند شاسواری**

دوای ئەوەی لە ١٩٨٢ سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانیمان لە سەرگەڵوو بەرگەڵووەوە گواستەوە بۆ سێڕوان و کانی توو لە ناوچەی مەرگە، هەرچەند مەترسی بۆمباران هەر هەبوو و جارجارە بۆمباران ئەکراین، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ناوەندی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بڕیاری دا خولی پەروەردەی کادێران بکرێتەوە و دەزگای ڕۆشنبیری کۆمەڵە کە کاک ئازاد هەورامی بەرپرسی بوو، بەو کارە هەڵبسێ. هەر لە کاک نەوشیروان و مامجەلال و تا من، کە لە زۆربەی کادرەکان گەنجتر بووم لەو خولە وانەمان ئەوتەوە.

هەندێ جار بۆ پشوودان و بۆ زاخاوی مێشک و بۆ ئەوەی کادرەکان زۆر ماندوو نەبن، بەرنامە دائەنرا و، یەکێک لەو

بەرنامانە هۆنراوە خوێندنەوەی کاک شێرکۆ بێکەس بوو.

وەک ئەزانین لەو خولەی هەشتاکاندا هۆنراوەکانی کاک شێرکۆ زۆربەیان داستانی و بە جۆش و خرۆش بوون و بە تایبەت بۆ پێشمەرگە ئەوتران و وەک حەمەی حەمە باقی ئەیوت: هۆنراوەی چەپڵە بوون. بەڵام هەمان ئەو هۆنراوە بەگوڕانە لە جێگەی خۆیاندا بوون و وەسپی ڕیالیستی ڕۆژەڤە دژوارەکەی شۆڕشی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان بوون و هەتا ئێستەش ماونەتەوە و هەر ئەشمێنن. بۆ نموونە لە یەکێک لەو کۆڕانەدا کە زیاتر لە ٧٠ کەس دانیشتبوون و کورسییەکان بە سێ ڕیزی سیانی دانرابوون، کاک شێرکۆ ئەوەندەی دەستی کرد بە هۆنراوە خوێندنەوە، دەستی ڕادێرا و بە دەنگی زەلاڵی وتی:

ڕێگە چۆڵکەن،

ڕێگە چۆۆۆڵ کەن، هەڵسنە سەرپێ

ئەسپەمارۆی گەرمیانە شەلاڵی خوێن بۆ ئێرە دێ...

دیمەنێکی سەیر بوو. ئەوەندەی وتی: **ڕێگە چۆڵکەن هەڵسنە سەر پێ**، هەموو ئەوانەی لە قراخی ڕیزەکانەوە دانیشتبوون هەڵسانە سەرپێ و ئاوڕیان دایەوە، تا بزانن ئەوە کێییە هاتووە؟!

کاک شێرکۆش کە غەزرابوو، زۆر بە تووڕەیی دەست ڕاوەشاند و وتی:

ـدانیشن کاکی برا، شیعر ئەخوێنمەوە!

بەڵام لە هەمان خولدا و لە دوای «هەڵۆسوورەکانی قەندیل» و زۆر هۆنراوەی بەجۆش بۆ ژیانی پێشمەرگایەتی، کۆمەڵێک

هۆنراوەش لەناو بڵاوکراوەکانیدا هەبوون کە زۆر قورس و بەناوەرۆک بوون و لە فەلسەفەی ژیان ئەدوان. لەگەڵ هاوڕێی هەمیشە زیندووم کاک یووسف شەریف هەولێری زۆر لەسەر ئەو هۆنراوانە ئەدواین و ئەو لای وابوو، کاک شێرکۆ ئەبێ ئەوانە لە قاڵبی تردا بنووسێ (هەر وەک دواتر بە شێوازی دەقی واڵا نووسیانی)، چونکە ئەوانە ئیتر شیعر نین و...

لە یەکێک لەو بەرنامانەی کاک شێرکۆدا، کاتی هۆنراوە خوێندنەوە، کاک یووسف، کە هەمیشە لای یەکەوە دائەنیشتین، دای بە سەر ڕانیدا و وتی: ـدەک مارت خەرا نەبێ کابرا...

لێم پرسی: ـئەوە چی ڕووی دا؟ منیش تێبگەیەنە!

وتی: ـدە جار ئەو هۆنراوەم خوێندەوە و هەر پێم هۆنراوە نەبوو، کەچی بەو جۆرەی خۆی ئەو هۆنراوەی خوێندەوە، ناچارم بڵێم بە ڕاستی چامەیە نە گاڵتە!

ئینجا ئەوەش بڵێم، کە دکتۆر برایمی یۆنسی ڕۆمانێکی یەکجار جوانی هەیە بە ناوی «نزا بۆ ئارمین». زۆر لە بەسەرهاتی د. قاسملوو و بنەماڵەکەی ئەچێ: کچێکی ئەرمەنی بە ناوی ئارمین لە لایەن کەسوکارییەوە لە لای ماڵە کوردێکی ئاشنایان لە دەڤەری ورمێ ئەشاردرێتەوە... پێرسۆنای یەکەمی ڕۆمانەکە کە گەنجێکی بەوەج و زیرەک و زیتەڵەیە و بەسەرهاتەکەمان بۆ ئەگێڕێتەوە، ئەڵێ:

ـبابەم هیچی نییە، هیچ نەخۆشینێکی نییە، بەڵام بە داخەوە گەیشتووەتە تەمەنێک لەبەر (کات) بەزیوە، کاتی ژیانی کۆتایی هاتووە و قوتار بووە...

منیش لەم هۆنراوەتدا بە ڕاستی، پاش چەند جار خوێندنەوە و هەر جارە زیاتر لێ وردبوونەوە، وەک کاک یووسفم لێهات و، هەستم بە هەندێ تێڕوانینی فەلسەفی کرد کە بڕوای بە دیالکتیکی بەردەوامی و بینینی سەرکەوتن بە چاوێ هاوبیران و هەمیشە گەش و هیواداربوون بە ژیان هەیە؛ وەکوو جەنگەڵستانی پاندۆ لە سەرەوە دارستانێکە بەربەرین و لە بنەوە بەس یەک ڕیشەی ڕەگاژۆیە؛ هەمان هەستە منیش هەمە و مەگەر ئەوانەی لە تەمەنی شەستیان لادابێ ئەگینا بەو قووڵییە لایان خۆیا نابێ، هەست بە بەزین لە بەرامبەر هێزی «کات» و تەواوبوون لە لایەک و، نەبەزین و «**ئومێد**»ی گەشی مانەوەی دیالکتیکی و گوڕ و هەڵپەی کارکردنی زیاتر و لە جیاتی نائومێدی و سستبوون، بەشداربوون لە داهاتوویەکدا ئەبینم، لە بوون و نەبوونمدا درێژەی هەیە و ئەویش:

**بەڵام چ خاوە خەونی چاو!**
**بەڵام چ خاوە خەونی چاو!...**
**چونک دڵم،**
**تەنووری ئاگر و**
**ئومێد**
**وەک مەشخەڵانی پڕ لە تین**
**بە شۆڕشی زەنی**
**ژنە...**

# «ئەی سەقز» ٢

ئەی سەقز، پەنجا لە شیعرم تێپەڕی و هێشتا ئەزم
هەر غەریب و لانەواز و هەر
پڕی تاسە و حەزم
هەست بەوەی ناکەم کە پیرم چونکە چاوانەی هەزم
بۆ تەواف و دیدەنت ئۆقرەم نییە و یەکسەر لەزم
چاوەڕێم دەر کا لە لەش، ئامێزی گەرمی تۆ، تەزم

تاخ و کۆڵانت ئەمێستا پڕ هەڵۆ و شێر و تەوار
"ژن، ژیان، سەربەستی" ئەمڕۆ بۆتە هێما و ڕێگەچار
ماڵ بە ماڵی ئەم جیهانە ناوی تۆیان کەوتە زار
"یازدە ئەستێرە"ت ژیانۆ، بوویتە ڕەمز و ئیفتیخار
ناوی "ژینا"ت بوو بە ڕووگە و نوێژ و ئایە و یادگار

ئەی سەقز تاکوو بمێنم چاو لە ڕێی دیدارتم
ڕۆڵەکەی جارانم و قەڵغانەکەی ئازارتم
تاسەبارم، تاسەباری دیمەنی نازدارتم

گەردی پێی تێکۆشەرانی گردی گوند و شارتم
شاعیری دڵ پڕ لە هیوای هەڵوەداکەی وارتم

پڕ، لە ئاستی خوێنی ڕۆڵەت توورەیی و خۆ ناگری
بۆ قەڵاچۆی ناحەزانت چەشنی کوورەی ئاگری
کیژ و خورتت ڕاپەڕیو، تۆش هەر قەڵا و خۆڕاگری
لانکی کوردی و لە سەر کوردایەتی، پێداگری
هەر دەمێنی، هەر دەمێنی، هەر دەمێنی، نامری

ئۆتاوا،سەرماوەزی٢٧٢٢

ئەم شیعرە دەگەڕێتەوە بۆساڵی ١٣٥١ی هەتاویی کە لە شاری بێجاڕ، شیعری "ئەی سەقز"ی ام نووسی. ئەوکات غەریب بووم و دوور لە زێد، ئێستاش هەر غەریبم و دوور لە زێد.



هێندە مەدوێ تۆ لە مردن، چون گەلێ شیرینە ژین
دیارە چایی تاڵە گەر، نەتبێ نەبات و هەنگەبین
چەرخ ئەسوورێ، دەر لە خەون و وازی تۆ ناکاتەوە
جا کە وابوو تێکە بادە و وا کەرۆ لۆچی جەمین

ئۆتاوا، ڕەشەمەی ٢٧٢٢

# تێهەڵکێش

چ بەختێ بوو، چ هاتێ بوو کە من وا کەوتمە داوت
دەس و پێ بەستە داماوم بە تاڵی زوڵفەکەی خاوت
سەر و ماڵ و دڵ و ڕۆحم دەبا بڕوا لە پێناوت

( زمانم شەق ئەبا یەکدەم ئەگەر بێتوو نەبا ناوت
بە کوێری دادەنیشم گەر لەبەر چاوم نەبێ چاوت)

تێهەڵکێشێ لە سەر بەیتێکی (ناو کەوان)،
لە مامۆستا "حەمدی"

ئۆتاوا، ڕێبەندانی ٢٧٢٢

تاڵێ کە ڕەها بوو لە پەچەت ئەی کچی "سەقز"

کوردانە هەموو خەڵکی جیهانی لە خەو هەستان

"ژینا" کچی کورد و گوڵی کورد و دڵی کوردە

ناوی لە پەڕەی کوردەوە هەستا، بووە دەستان

ئۆتاوا، ٢٧ی ڕەشەمەی ٢٧٢٢

# ئەوین

تاڵێکە ئەوین، گرێ دەدا جووتێ دڵ

هەستێکە لە تان و پۆ، گەش و گەرم و کڵ

ئاوازی هەناوی پڕ لە تاسە و مەیلە

شەیداییە، دنیایەکە بێ وێنە و تڵ

ئۆتاوا، بەفرانباری ٢٧٢٢




زمانم لاڵ ئەگەر بێت و لە خۆ نامۆ بێ گوفتارم

چ پێویستم بە ناخۆیە، کە خێوی خۆشترین زارم

گەلێ ڕەنگین و زەنگینە، لەبار و کەون و سەنگینە

پەژ و خۆشبێژ و شیرینە

لە سای ئەم زارە ئەشعارم

ئۆتاوا، ڕەشەمەی ٢٧٢٢

**بۆ ڕۆژی جیهانیی زمانی دایک**



# تاسەگا

چەم یەمی ئەسرە لە دووریی "چلچەمە"
هەرچی باسی جوانیی وارم کەم، کەمە

"مێرگە نەخشینە" و "وەنەوشە" و "نەکەرۆز"
تاسەگا و ڕووگەی هەناوی پڕ لە سۆز

دڵ گراوی گوڵگراوی شارمە
دەردەدووریی پشکی پڕ ئازارمە

تاقە تاقەت، بارە لێو، خوێنە هەناو
بۆ چەلی کۆتایی دیداری "زەناو"

ژاڵەبارە، شەونمە دەتکێ لە چەم
ڕووگەیە بۆ من هەموو دەم زێدەکەم

ئاوەدان ئەی شارەکەی "ژینا" و ژیان
تا هەبم، ناوت بژیوە بۆ گیان

ئۆتاوا، ١٧ی ڕەشەمەی ٢٧٢٢

# گەڵا و نیشتمان

لە زایەڵەی شینی «ژینا»،

لە ناخی گڕکانی گیانم

گڕژانێکی کڵێی هاوار

بوو بە چامە و

چۆڕایە خوار

کە چاوی پشکووت بە ژانم

ئۆقرەی نەما و

بەلەز ڕێ کەوت

بۆ باشووری،

کوردستانم

تاکوو ببێت،

بە سروودی خۆشەویستی

بۆ شەهید و

نیشتمانم



بەڵام بێئاگا بوو لەوەی

ڕاژێر،

کراوە بە بازاڕ

کڕ و سڕ و دەستەمۆیە و

چیدی،

تێناگا لە ئازار

خۆشەویستیی نیشتمانیش،

بۆتە ئەفسانەی

بێ کڕیار

سەری پڕسەودای

قەتیسە

لە تۆی گەڵای،

سەوزی دۆلار...

ئۆتاوا، ١٣ی سەرماوەزی ٢٧٢٢



# سکاڵا

مەخابن پیرە «گۆران»، دابی کۆمەڵگا نەگۆڕایە
ئەمێستاکەش هەر ئەو دابە و هەمان ژانی گەدە و بایە

هونەر نامۆ و هونەرمەندیش، هەموو دەم تاک و تەنیایە
سەراپا هەوڵی بێوارە و، بە وێنەی پووشی دەم بایە

لە ناخی پڕ لە زامی کەس، هەرای ئازادی دەر نایە
ئەوەی تێیدا دەتووڕێنن، لە دوورە و دەنگی زوڕنایە

کەسی گەمژە و نەزان و دز، سەرۆک و میر و پاشایە
بەری خوێنی شەهیدانیش، لە سفرەی ماڵە جاشایە

هونەر لەم چاخەشا هێمان، دۆلار و سات و سەودایە
ئەوەش ئەورۆ دەڵێ ڕوونم، لە ترسا دەنگی دەرنایە!




ئەوەندەی خوێن ڕژا سەرجەم، حیزب کردی بە دەسمایە
هەژاریش دەستەمۆی فێڵ و دهۆی بازاڕ و سەرمایە

درۆزن بۆتە ڕامیار و، نەزانیش خاوەنی پایە
نە ناوی "نیشتمان" ماوە، نە "کوردبوون"یش لە ئارایە

(بەڵێ ڕاستە، لە نێو قەومی بەسیتا قەدری سەنعەتکار
لە نێو حەوزێکی لیخندا، وەکوو عەکسی قەمەر وایە)*

ئۆتاوا، کۆتایی پاییزی ٢٧٢٢

*پێشوازییەک لە شیعری "دەرویش عەبدوڵا"ی مامۆستا گۆران.

# یازدە ئەستێرە

شەوێکی ڕەش

ساماڵ و کز

لە هەناوی تاریکییدا

لە ئاسمانی،

ساوی ڕێبەندانی "سەقز"

"یازدە ئەستێرە" هەڵکشان

گەشانەوە

گەشانەوە...

بەرەو بەرزایی و

کاکەشان

بوون بە شنۆ و

موژدەی بەیان

بوون بە میری ئازایەتی

بوون بە بیری کوردایەتی

مەزن مانەوە و

دەرەوشان

بوون بە شانازی بۆ مێژوو

بوون بە تاپۆ و

بوون بە ڕێچکەی،

هیچکاتێ لە بیرنەچووی

ڕێبەندان

ئۆتاوا، خاکەلێوەی ٢٧٢٣



# لە یادی
# یازدە ئەستێرەی سەقز

١ . شەهید ئەحمەدخانی فاڕوقی (سالار سەدر)، جێگری هێزی بۆکان و ناوچە . شەهید ئەحمەدی فاروقی، بە "ئەحمەدخانی خەلیل خان" یان بە ناوی گوندەکەیەوە بە "ئەحمەد خانی قەیلەسوون" دەناسرا و لە بنەماڵەی فەیزوڵابەگی بوو.

٢. شەهید محەمەد خانی دانیشوەر، خاوەن مڵک و ڕاوەندی گوندی "ئاڵکەلوو"ی سەقز و برای ئەحمەد خانی فاروقی، لە بنەماڵەی فەیزوڵابەگی بوو؛

٣. شەهید ، خاون مڵکی گوندی"داشاڵووجە"ی سەقز و برای ئەحمەدخانی فاروقی و محەمەد خانی دانیشوەر و لە بنەماڵەی فەیزوڵابەگی بوو؛

٤. شەهید عەلی خانی فاتیح، خاوەن مڵکی گوندی "قەلەندەر"ی سەقز و لە بنەماڵەی فەیزوڵابەگی بوو؛

٥. شەهید مەحەمەد خانی فەیزوڵا بەگی (حەمەخانی ئاغاخان بەگ خاون مڵکی گوندی "قارەوا چکۆڵە"ی سەقز و لە بنەماڵەی فەیزوڵابەگی بوو؛

٦. شەهید ئەحمەدخانی شەجیعی، خاوەن مڵکی گوندی "کەڵتەگە"ی سەقز و لە بنەماڵەی فەیزوڵابەگی بوو؛

٧ . شەهید حەسەنخانی فەیزوڵابەگی، خاوەن مڵک و ڕاوەنی گوندی "کانی نیاز" ی سەقز لە بنەماڵەی فەیزوڵابەگی بوو؛

٨. شەهید شێخ سدیقی ئەسعەدی، خاوەن مڵکی گوندی "یازی بڵاغی" سەقز ؛

٩ . شەهید شێخ ئەمین ئەسعەدی، خاوەن مڵکی گوندی "کەس نەزان"ی سەقز؛

١٠ . شەهید ڕەسووڵ ئاغای مەحموودی، خاوەن مڵکی گوندی "میرەدێ" و لە هۆزی گەورکی سەقز؛

١١ . شەهید عەلی ئاغای جەوانمەردی، خاوەن مڵکی گوندی "تەمووتە" و لە هۆزی گەورکی سەقز.



# تاڵفۆنیای بەڕوو

له گەردەلوولی ئایاتی هەشتاوهەشتا

له سووڕەی تاڵی بێبەزەی ئەو ئەنفاله

له "ناساڵح"ی

پشت "کفری" و

له سنووری،

شۆرەکاتەکەی "دیاله"

له هەناوی هەردی سووتاو

له مینستانێکی

ڤاله

له ژێر چنگی،

گۆڕهەڵکەنه و

کەڵپەی ڕەقی ڕقی

چاله...

له چاڵێکی ئەنفالاویی

له ناو دۆزەخێکی تردا

له تۆی تەرمستانی، گۆڕغەریبیی و

ژانی کوردا...

دەنگێ بەڕوو

لە گیرفانی پانتۆڵی منداڵێ وردا

چەکەرەی کرد

سەری هەڵدا و

بوو بە درەختێ پەڕیوە و

بوو بە ساباتی گۆڕێکی بەکۆمەڵی پڕ لە کورد و

هێمای ڕوونی ڕووماڵینی

تاوانێکی،

دەیان ساڵە...

ئەمە،

نە شانۆی هاڵییوود

نە دیرۆکێکی کەونارا

نە ئەفسانە و

نە،

خەیاڵە!

بەڵکوو،

# ڕۆژەڤی "کوردبوون" و زایەڵەی"تاڵفۆنیا"ی کۆڕی یەکسەد و هەشتا و دوو هەزار گیانی خامۆشی ئەنفالە...

ئۆتاوا، کۆتایی جۆزەردانی ٢٧٢٣

**وردە سەرنجێ:**

"ناسالّح"، ناوی گوندێکە لە پشت کفری، لە سنووری پارێزگای دیالە. ئەوانەی کاری دۆزینەوە و پووچەڵکردنەوە و هەروەها پاککردنەوەی زەوینیان لە لوغم و مین، لەو شوێنەدا کردوە، لایان سەیر بووە کە، لەم شوێنە قاقڕە کە قەت داربەڕووی لێ نەبووە، چۆنە کە تاقە دار بەڕوویەک سەوزبووە؟! دوای هەڵکۆڵینی زەوییەکە، سەیریان کردووە و بینیویانە، تەرمەکانی بنەماڵەیەکی کورد کە بەر شەپۆلی ئەنفال کەوتبوون، لەو چاڵەدا نێژراون و لە نێویاندا، ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشاون لە نێو ئەو گۆڕە بەکۆمەڵەدا، تەرمی منداڵێکی کوردی یازدە ساڵان بووە کە دەنکە بەڕوویەک لە گیرفانی پانتۆڵەکەیدا، چەکەرەی کردوە و سەری لەو گۆڕە دەرهێناوە و بۆتە ئەو داربەڕووە و بەڵگەی هەڵدانەوەی تاپۆیەکی ڕەشی دیکە لە ئەنفالی هەشتاوهەشت.

# مەترسیی

دیسان هار بوون و
خوێنتان ڕشت
سەری ڕۆڵەی "خۆ"تان خوارد و
خەنجەری "خۆ"تان دا لە پشت
لە ویژدانی بێویژدانی تەنانەت خۆشتان
نەپرسی!...
هیواکانی،
"هیوا"تان کوشت
"سامان"تان کرد بە قوربانیی،
زرەدەسەڵات و
کورسی
پردتان نەهێشت لە دوای خۆتان
کەی واز دێنن،
ئەی دەسکردە گەوشتەکان
سیسارکە لاشەخۆرەکان

بنکردە بێ ڕەوشتەکان

تەنیا ئێوەن بەربەست لە ڕێی،

ئازادیی خاک و نیشتمان

گەلۆ چاوتان لە خۆتانە؟!

نەگۆڕاون،

هەر خۆتانن!

وردەدیکتاتۆڕ، سەرەڕۆ

هێشتا هەر بەگزادە و ئاغە

دەیانساڵە

لە نێو شووشەبەندی نوێنگەکانی باشوور

وەک چاتۆڵ و

بووکەباغە،

گوێتان کەڕ و چاوتان کوێر و

بۆ دەسەڵات،

برسیی، برسیی...

دڵنیا بن...

دڵنیا بن

هەر ئێوەشن

له سەر گیان و

ماڵ و ژیانی گەل و ڕۆڵەی،

گەورە خەسار و

مەترسیی!...

بۆ "هیوا" و "سامان"، دوو گەنجی شەهیدی پاوانخوازیی وردەئاغاکانی کۆمەڵە.

ئۆتاوا، هەر ئێستا لەوپەڕی تووڕەیی و بێزاریدا،

ای پووشپەڕی ٢٧٢٣

# چوارینە

ئەوەی "نەتەوە" پێی پشت ئەستوورە

زار و هونەر و وێژە و کولتوورە

هێزی دەوڵەتی کورد لەم چوارێنە

بێ بڕانەوە و ڕێژە و سنوورە!

ئۆتاوا، خاکەلێوەی ٢٧٢٣

# شەونم و گڕ

چەما بەژنیَ بە سەر بەژنی جوانیَ
گەیی لەو ناوەدا جانیَ بە جانیَ

پەلی ئاوەنگی گوڵ جەم بوونە نێو جام
لەگەڵ مەعجوونی شەکر و مەغزە بادام

سەدەف شیلەی لە پۆپەی مرژەنا چڕ
لە ئامێزا حەوانۆ شەونم و گڕ

ئۆتاوا، گوڵانی ٢٧٢٣



شده چنبر میانی بر میانی
رسیده زان میان جانی به جانی

چکیده آب گل در سیمگون جام
شکر بگداخته با مغز بادام

صدف بر شاخ مرجان شهد بسته
به یکجا آب و آتش عهد بسته

نیزامیی گەنجەوی

# سەودا

شەمعم، لە کۆڕی بەزمی هەڤاڵان تواموەوە

دڕکم، لە پاڵ و سێبەری گوڵدا حەوامەوە

گەنجیی، حەکایەتێ بوو کە نەمدی بە عومری خۆم

سەرهاتی دەور و بەر بوو، کە بۆیان گەڕامەوە

سەودایە بەفری ئەم سەرە تەک چەرخی بێ ئەمەگ

گەردوون، بە نەختی گەنجەتی، تاوانی دامەوە!

ئۆتاوا، ١٦ی پووشپەڕی ٢٧٢٣





اشکم ولی به پای عزیزان چکیده ام
خارم ولی به سایه ی گل آرمیده ام

من جلوه ی شباب ندیدم به عمر خویش
از دیگران حدیث جوانی شنیده ام

موی سپید را فلکم رایگان نداد
این رشته را به نقد جوانی خریده ام!

رهی معیری

# ڕەوتی تەمەن

هەرگیز بە خەونیش نەمدەدی
سەر بێتە قەندیلی بەفر
ئاوا بە تاو و بە لەز
من هاودەمی بادە و خەیاڵ
ناڵەی دڵ و سۆزی شمشاڵ
پڕ زایەڵەی سۆز و حەز

( داماوم و حەیران، لە ڕەوتی عومری سەرگەردان،
ئەی خودایی من
بەم جەستە هیلاکە، دەڵێ ئەم بەستە خەمناکە،
ماڵئاوایی من
ئەی ئەشقی بێ ئاکامی من بۆچی ونی!
بۆ بێبەزە پەلک و گەڵای عومرت ڕنی!
ئەی دڵ بڵێ پێم بۆچی وا کەیل و پڕی؟!
شابازی ئاواتی تەمەن بۆ کوێ فڕی!

بچرە ئاوازی دەروون شەو تا بەیان بولبولی چڵ
لە ڕکەی سینە خەریکە بێتە دەر بەم شەوە دڵ

سرک و سووک باڵ دەگری و منیش قەتیسی قەفەسم
تۆ پڕی شەوقی ژیان منیش لە کۆتا نەفەسم
بخوێنە، بخوێنە و تۆ بێژە بەم عالەمە
کە تەمەن بە پەلە و دەرفەتی ئێمە کەمە)٢

هرگز نمیشد باورم
این برف پیری بر سرم، سنگین نشیند چنین
من بودم و دل بود و می
آواز من آوای نی، هر گوشه میزد طنین
اکنون منم حیران، ز عمر رفته سرگردان، ای خدای من
با این تن خسته، هزاران ناله بنشسته، در صدای من
ای عشق نا فرجام من رفتی کجا؟
ای آرزوی خام من رفتی کجا؟
آن دوره آشفتگی های تو کو؟
ای عمر نا آرام من رفتی کجا؟
تو بخوان شب همه شب برایم ای مرغ سحر
که دل خسته من درامد از سینه به در
تو سبک بالی و من اسیر بشکسته پرم
تو پر از شوری و من ز عالمی خسته ترم
تو بخوان تو بخوان به گوش اهل جهان
که خبر شود از شتاب این کاروان

# تەوار

له بوومەلێڵی چاوی هاوای ڕەشەمە

ئەستێرەیەک دەدرەوشێت و

له ئاسۆی لێڵەوە

دیارە

له تۆی تاپۆی شەوەزەنگا

نقێمێکی درەوشاوە و

هێمایەکی،

پرشنگدارە

ئەو ئەستێرە...

میوانی حەڤدەی ڕەشەمە و

شاسواری شەهید،

( تەوارە )...



ئۆتاوا، ڕەشەمەی ۲۷۲۱

بۆ یەکەم شەهید مەستوورە شاسواری (تەوار)

# کۆبەندێک
# لە وتە بە تامەکانی تاراوگە

## پێشەکی:

ئامانج لە کۆکردنەوە و نووسینەوەی ئەم بیرەوەریانە کە هەرکام لە سووچێکدا ڕوویان داوە، ڕزگارکردنی قۆناغێکی زۆر تایبەتە لە تیاچوون و هەروەها یارمەتی بە باشتر ناساندنی باری نائاسایی ژیانی پەنابەران کە، لە کۆتایی حەفتاکانە وە ڕوویان کردە هەندەران بەهۆی باری ئاڵۆزی وڵاتەکەی خۆیان و ژیانی هەندەرانیان هە ڵبژارد.

دیارە بۆ خۆ ڕێخستن لەگەڵ هەلومەرجی تایبەتی ژیانی تاراوگە، پەنابەر هەوڵی داوە تا بەهەر شێوە کە دەتوانێ، فێری زمان و ئاخاوتنی وڵاتی نوێ بێت و خۆی لەگەڵ داب و نەریتی نوێدا بگونجێنی.

هەر لە سەرەتاوە کە دەچێتە فێرگەی فێر بوونی زمان، پێداویستییەکانی ژیان هانی دەدات کە بە زمانی نوێ قسە بکات.

لە بەکارهێنانی زمانی تازەدا، گەلێک جار کارەساتی زۆر سەیر ڕووی داوە کە وەکوو نوکتە باسی لێکراوە و ئەوانەی کە بیستوویانە، بۆ ماوەیەک پێکەنیون و خەمەکانیان شەن کردووە بەڵام، پاش ماوەیەک لە بیریان چووەتەوە و ئەو قسە خۆشەش بەداخەوە فەرامۆش کراوە.

من وام بە باش زانی کە قۆڵی لێ هەڵماڵم و لەهەر سووچ و کەنارێک ئەو وتە خۆشانە کۆبکەمەوە و وەک نامیلکەیەک بیخەمە بەرچاوی خوێنەران.

پێم وایە ئەم کارە، وەکوو ئەرکێک پێش چاوی نەوەکانی داهاتوومان ڕوون دەکاتەوە لە بواری لێکۆڵینەوە تایبەتەکانی ژیانی پەنابەران لە هەموو کەرتێکدا و هەروەها، دەبێتە هۆی بزە و پێکەنین و شادی ئەو خۆشەویستانەی وا باری نالەباری ژیانی ئەستەمی ئەم سەردەمە، تەنگی پێ هەڵچنیون.

بەو هیوایە کە ئەو خۆشەویستانەی وا لە هەر شوێنێکی هەندەران هەر نوکتەیەکی خۆشی لەم بابەتەیان لەدەستدایە، بۆمانی بنێرن تا ئەم بەشەی پێ دەوڵەمەندتر بکەین.

بە هیوای کاتیکی خۆش بۆ هەموو خۆشەویستان.

براتان : حەسەن شافێعی

ئۆتاوا ــ کانادا ڕێکەوتی ٢١ ی ڕێبەندانی ٢٧٠٧

فێبرواری ٢٠٠٨

## Grrrrrrrrrrrrr

برادەرێکی پەنابەر لە شارێکی پارێزگای ئۆنتاریۆ لە کانادا، دوکانی دەبێت. دوکانەکەی پیزافرۆشییە و بۆ خۆی سەرپەرشتی کاروباری دوکانەکەی دەکات واتە بەڕێوەبەر یان مەنیجێرە.

ڕۆژێک تەلەفونی دوکانەکەی باش ئیش ناکات و هەر ئەمە ئەبێ بە هۆی ئەوە کە هاوکارانی پێی ڕابگەیەنێن کە کارەساتێکی وا قەوماوە.

ئەویش تەشریف دێنێ بۆ دوکان و تەلەفون دەکات بۆ: Bell Canada واتە ئەو کۆمپانیایەی کە خاوەنی هێڵی تەلەفونەکەیە.

پاشان دەفەرمێ:

–My phone is not working.

واتە تەلەفونەکەی من ئیش ناکات. ئەو کەسەش کە بەرپرسی وڵامدانەوە یە و هەروەها لە باری تێکنیکییەوە دەتوانێ ڕێنوێنی بکات لێی دەپرسێ :

–What is the problem Sir?

واتە کێشەکە چییە جەناب؟

ئەم خۆشەویستەش لە وڵامدا دەڵێ:

–One GRRRRRRRRRRRRR.... and that's it.

مەبەستی ئەوە بووە کە تەنیا یەک زەنگ لێدەدات و پاشان هیچ.!!

# Hospital

خۆشەویستێک تازە هاتبوویە وڵاتی کانادا و ڕۆژێک لە ڕۆژان ئیشی دەکەوێتە نەخۆشخانە.

بۆ ئەم مەبەستە، لەسەر شەقامی نزیکی ماڵی خۆیان چاوەڕیی باس (ئوتووبووس) دەکات.

کاتێ کە باسەکە دێت ئەم برادەرە سوار دەبێت و شۆفێری باسەکە بە زمانی ئینگلیسی لەگەڵیا دەدوێ.

ئەم برادەرەش کە تازەکوورەیە و زمان نازانێ، پێی وایە لێی دەپرسێ بۆ کوێ دەچی بۆیە دەڵێ: Hospital واتە نەخۆشخانە. شۆفیرەکەش بە دەستی ئیشارە بە ئەو جەعبە (باکس)ە دەکات کە خەڵک بلیت یان پارەی تێدەکەن. بەڵام ئەم برادەرە هەمدیسان تێناگات و دووپاتی دەکاتەوە: Hospital.

شۆفیرەکەش جارێکی دی بە دەستی ئەو باکسە نیشان دەدات و بە زمانی ئینگلیسی پێی دەڵێتەوە:

کە پارە یان بلیتەکەت بخەرە ناو ئەو باکسە. ئەم خۆشەویستەش بە جۆرێکی دیکە تێدەگات. ئەوەیە کە دەچێتە پێشەوە و بە هەموو توانای خۆیەوە دەمی دەنێ بە باکسەکەوە و هاوار دەکات:

Hospitaaaaaaaaaaaaaalll...........



# Smell

یەکێک لەو ئیشانەی کە لە سەرەتای هاتن بۆ وڵاتی نوێ بڕێک پەنابەری پێوە سەرقاڵە، ئیشی بردنی پیزا بۆ ماڵانە.
شەوێکیان برادەرێک دوو دانە پیزای پێ دەبێت کە بیبات بۆ نهۆمی ١٠ لە تەلارێکدا لە شاری ئۆتاوا.

کاتێک کە دەگاتە داڵانەکەی نهۆمی یەکەم، لەگەڵ کابرایەکدا کە دانیشتووی ئەو شوێنەیە، پێکەوە دەچنە ناو ئاسانسۆرەکە. دەرگای ئاسانسۆرەکە کە دادەخرێ، بۆنی پیزا بڵاو دەبێتەوە.

کابرای ناو ئاسانسۆرەکەش کە دیارە برسییەتی بۆنەکەی پێخۆش دەبێت و بە ئینگلیسی پێی دەڵێ :

–Mmmmmmmmmmmm Smell's Good.

واتە ئممممم کە بۆنەکەی خۆشە. برادەری پیزاش کە پێی وایە باسی سایزی پیتزاکەیە، زۆر بە تێڕادیوی وەڵام دەداتەوە:

–Sir. This is not Small, It is Medium.

# Not Hot!

برادەرێک لە پارێزگای ئۆنتاریۆ لە کانادا، فەرمانبەری کۆمپانیایەک دەبێ کە ئەرکی ڕاگرتنی ئۆتۆمۆبیل و پارک کردن و ئاگاداریکردنی لە ئەستۆیە.

ئەم برادەرە هەموو ڕۆژێک بە شێوەی ئاسایی بەیانی زوو دەچێ بۆ ئیش و ئێوارە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.

دیارە پێشتر ماوەیەک لە فێرگەی زمانی ئینگلیسی دا وانەی خوێندووە و تا ڕادەیەک کە بتوانێ ئیشێکی وا هەڵسووڕێنێ، متمانەی بە خۆیەتی.

هەمەڕەنگ و هەمەجۆر مشتەری دەبێت و جار و بار هەروا قسەگەلێکی ئاسایی لە گەڵ مشتەریەکاندا دەکات.

ڕۆژێک مشتەرییەک لە کاتێکدا کە خەریکە لە شوێنی پارکینگەکە بێتە دەرەوە، لەم برادەرەمان بە ئینگلیسی دەپرسێ: ئایا ئەتۆ موسوڵمانی؟

ـAre you muslim?

ئەم برادەرەش کە کارەساتی ١١ی سێپتامبر و ڕەنگدانەوەی شوێنی لەسەر دانابوو، خێرا وەڵام دەداتەوە و دەڵێ:

ـYes, but not hot!



# Oui Oui *(WeeWee)*

برادەرێکی کورد لەگەڵ هاورێیەکی لە شاری ئۆتاوا دەچن بۆ شاری مۆنتریاڵ بە نیازی دانانی دوکانی پیتزافرۆشی لەوێ.

پاشان کە کارەکانیان جێبەجێ دەکەن و بە موبارەکی دوکانەکەیان دەکەنەوە، تەلەفۆنێک دەکرێ و مشتەرییەک بە زمانی فەڕانسەیی دەیەوێت سفارشی پیتزا بدات. (زمانی زۆرینەی دانیشتوانی مۆنتریال، فەرانسەیە).

هەرچی کابرای مشتەری قسە دەکات، ئەم برادەرەی خۆمان هەر دەفەرمێ:

ـوی وی... وی وی...

واتە بەڵێ بەڵێ....

پاش ماوەیەک، تەلەفۆنەکە تەواو دەبێت و هاوڕێکانی لێی دەپرسن:

ــئەرێ ئەوە چی بوو ئەو هەموو وی وی یە؟

دیارە کابرای مشتەری بە فەڕانسەوی قسەی کردووە و داوای پیتزای کردووە.

ئەم برادەرەی خۆشمان کە بەقەد تووڕێکی لێ تێ نەگەیشتووە، وەڵام دەداتەوە:

ئەوە Bell Canada (کۆمپانیای تەلەفۆنی کانادا) بوو، تەلەفۆنی کرد هەتا بەخێرهاتنی ئێمە بکات بۆ مۆنتریاڵ!!

# Kurd i Somalia

لە سەرەتایساڵەکانی ٩٠ دا، لە وڵاتی کانادا لە پارێزگای ئۆنتاریۆ، و لە شاری ئۆتاوا، کالێجێکی بە ناوبانگی لێیە کە لەوێ ئەو پەنابەرانە وا تازە هاتبوونە ئۆتاوا، کۆمەڵێکیان دەچوون بۆ ئەم کالێجە بۆ خوێندن و فێربوونی زمانی ئینگلیسی وەکوو زمانی دووهەم.

بەم پرۆگرامە دەڵێن: ESL واتە ئینگلیسی وەکوو زمانی دووهەم.

رۆژێک لە سەرەتای دەستپێکردنی ئەم کەلاسە، کە چەند کەسی کوردیشی تێدا دەبێت. لە بەر ئەوەی کە کوردەکان یەک دەناسن بۆ ئەوەی غەریبی نەکەن، ئەو رۆژی یەکەمە، چواریان لە ریزی پێشەوە، لە تەنیشتی یەکتردا دادەنیشن.

پاش ماوەیەک، مامۆستای پۆلەکە دێتە ژوورەوە و دوای سەیرکردنی ناو پۆلەکە خۆی دەناسێنێ و بەخێرهاتنی هەموویان دەکات. دواجار داوا دەکات لە خوێندکاران کە بەریز، یەکە یەکە خۆیان بناسێنن. جا لە ریزی یەکەمەوە و لە پێشەوە کە ئەو پەنابەرە کوردانە دانیشتوون پێدا دێت.

ــناوت چییە؟ خەڵکی کام وڵاتی؟

ـWhat is your name? where are you from?



یەکەم کورد وەڵام دەداتەوە:

ـMy name is Awat and I am from Kurdistan part of Iran.

واتە ناوم ئاواتە و خەڵکی کوردستانم بەشی ئێران.

کەسی دووهەم:

ـMy name is Omed and I am from Kurdistan part of Iraq.

ناوم ئومێدە و خەڵکی کوردستانم بەشی ئێراق.

کەسی سێهەم:

ـMy name is Arezu and I am from Kurdistan part of Turkey.

ناوم ئارەزووە و خەڵکی کوردستانم بەشی تورکیە.

کەسی چوارەم:

ـMy name is Hevi and I am from Kurdistan part of Syria.

ناوم هێڤییە و خەڵکی کوردستانم بەشی سوریە.

کەسی پێنجەم:

ـMy name iIs Ahmad. I am from Kurdistan part of Somali

واتە من ناوم ئەحمەدە و خەڵکی کوردستانم بەشی سۆمالی!!!

# Viza

کۆتایی ساڵی ٩١ی زایینی بوو کە من، حەسەنی شافێعی، لەگەڵ بنەماڵەمدا گەیشتمە شاری تۆرنتۆی کانادا.

ماوەی چەند حەوتەیەک بوو کە لەوێ دەژیاین. لە نهۆمی ١٥ی تەلارێکدا خانوویان پێدابووین. سێ فێرگە لە دەوروبەری ماڵەکەماندا بوون و هەروەها دوو بازاڕۆکەش بۆ شتومەک کڕین.

لە پەنای یەک لەم بازاڕۆکانەدا، دوکانێکی گەورەی لێ بوو بە ناوی ڕاجرز. ئەم دوکانە تایبەت بوو بە فرۆشتن و بە تایبەت بەکرێدانی فیلمی سینەمایی و هەروەها ڤیدیۆ و بەشی بابەتی منداڵان.

ئێوارەیەک من و خێزانم لەو بازاڕۆکە بووین، بڕێک کەل و پەلمان کڕیبوو، هەروا سەرێکمان دا لەو دوکانی فیلم و ڤیدیۆش. سەیرمان کرد وا خەڵک لەوێ دەگەڕان و بۆخۆیان فیلم و شتی وایان هەڵدەگرت و دەچوونە بەر مێزی مشتەری و لەوێ پارەکەیان دەدا و فیلمەکانیان بە کرێ وەردەگرت.

ئێمەش چەند دانە فیلممان هەڵگرت و کاتێک لە ڕیزدا بووین و نۆرەمان هات، ئەو ئافرەتە کە مشتەری بەڕێ دەکرد، داوای کارتی ئەندامەتی لێکردین و ئێمەش نەمانبوو.

پاشان داوای ڤیزای لێکردین تا بمانکات بە ئەندام و ئەوسا بتوانین بە دڵی خۆمان فیلم بەکرێ بگرین. منیش گوتم:



ــڤیزام هەیە. بەڵام لە ماڵە و دەبێ بچم بیهێنم.

هەڵاتم بۆ ماڵەوە و ئەو ڤیزایانە کە UNHCR واتە **کۆمیسارییای باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پەنابەران** لە تورکیە پێی دابووین، هەڵمگرت و بردم و دیسان چوومەوە سەرە تا نۆرەم هاتەوە. ئەمجار زۆر بە تێڕادیوی خستمە سەر مێزەکە و گوتم:

ــفەرموو ئەمەش ڤیزا.

کچەکە زەردەیەک گرتی بەڵام هێشتا هەر بە حورمەت و ڕێزەوە کە من زیز نەبم سەیری کردم و گوتی:

ــئەمانە ڤیزای هاتوچۆیە، من ڤیزای بانک یان کارتی ئێعتیباریم پێویستە. مشتەریەکانیش لەو لاوە چاوەڕێ بوون کە من قوتار ببم.

منیش نەمدەزانی کە ڤیزا جۆری تریشی هەیە، لەبەر ئەوەی تازەکوورە بووم و تازە لە تورکیەوە هاتبووم هەر ئەو ڤیزام دەناسی، بۆیە بە هێواشی سەرم داخست و هاتمە دەرەوە. گەردنی ئەوانەشم ئازاد کرد کەوا، پێموا بوو پێم پێکەنیبوون. بەڵام دواجار بۆم دەرکەوت کە چۆنە.

هەر چۆنێک بێ ئەمەم نووسی بۆ ئەوەی ئەو خۆشەویستانە وا وەک من لێیان قەوماوە بە هۆی نەزانینی زمانەوە، نەڵێن بۆچی لە سەر خۆی شتی نەنووسیوە.

# Grammar

لە فێرگەی زمانی ئینگلیسی لە شارێکی کانادا، چەند کوردێکی تێدا دەبێت کە دەچن بۆ ئەم فێرگە تا بتوانن بەشی خۆیان زمان فێر بن و دەست کەن بە کارێک بۆ خۆیان.

دیارە لە پۆلی زماندا، لە گرامێر یان ڕێزمانەوە دەست پێدەکەن و بەرەو نووسین و خوێندنەوە و بابەتەکانی دیکەش دەچن. ماوەیەک دەگوزەرێ و هەموو ڕۆژێک ئەو خوێندکارانە بە دڵێکی خۆش و پڕ لە هیوا دەچن بۆ فێرگەی زمان.

ڕۆژێک، چەند دانە لەو کوردانە، لە کاتی پشوودان دا دەچنە حەوشەی فێرگە و بۆ خۆیان دەستدەکەن بە قسە کردن.

ئافرەتێکی کورد کە دیارە لەو وەزعە زۆر هیلاک بووە و بە دەست گرامێرەوە گیری خواردووە، وەکوو گلەیی و دەربڕینی ڕای خۆی سەبارەت بە زمانی تازە، ڕوو دەکاتە برادەرێکی کورد و پێی دەڵێ:

ــئەرێ فلانە کەس دەزانی زمانی خۆمان زۆر ئاسانتر و باشترە لەم زمانی ئینگلیسییە؟

برادەرەکە بە سەرسووڕمانەوە لێی دەپرسێ: ــچۆن؟!

ئەو ئافرەتەش وەڵام دەداتەوە: ــبەزنییە زمانی خۆمان ئەم جێناو و کار و بەرکار و لەم جۆرە تەرەماشانەی تێدا نییە. ئاگات لێیە چۆن بۆ خۆمان ئاوا بە ئاسانی قسەی پێ دەکەین!!!



# Divorce

لە ساڵەکانی ٩٠دا لە ئۆستراڵیا گۆشتی مەڕ هەرزان دەبێت و بە وتەی هاوڕێیەکمان کە لەوێ دەژی، کیلۆی لە نێوان ٢ تا ٣ دۆلاردا دەبێت.

بەڵام بەسەر ئەو نرخە هەرزانەشدا، زۆر جار پەنابەرەکان بە ٢ یان ٣ ماڵ یەکیان دەگرت و دەچوون بۆ فارم واتە مەزرا، بۆ کڕینی مەڕێکی ساغ بە نرخێکی کەمتر لە بازاڕ.

ڕۆژێکیان برادەرێکی کورد و برادەرێکی فارس کە هاوسێ و جیرانی یەکترن، ڕێ ئەکەون کە پێکەوە بچن بۆ مەزرا بۆ کڕینی مەڕێکی ساغ بۆ هەر دوو لایان.

پاشان بیر لەوە دەکەنەوە کە لەوێ چۆن بە ئینگلیسی کابرا تێبگەیەنن کە بەشەکانیان بۆ جیا بکاتەوە.

برادەرە فارسەکە سەیری قامووسی ئینگلیسی – فارسی دەکات و بە گومانی خۆی واتای: (جدا شدن واتە جوداکردنەوە) دەدۆزێتەوە و زۆر بە تێراونی دەچێتە پێش و بە کابرای مەڕدار دەڵێ:

_Can you give me one sheep and Divorce it in half?

واتە: دەتوانی مەڕێک بدەی بە من و لە ناوەڕاستەوە تەڵاقی بدەی؟!

دیارە مەبەستی جیاکردنەوەی مەڕەکە بووە بە دوو بەش بەڵام بەم شێوە دەری بڕی.

**کۆتایی:** به داخەوە ماوەیەکی دوور و درێژ چاوەڕوان بووم بەڵکوو خەڵک هاوکاریمان بکەن و بابەتەکانیان بنێرن؛ بەڵام به داخەوە ئەوە ڕووی نەدا و ئەمنیش هەر بەم چەند دانە قەناعەتم هێنا و دامنان بۆ ڕۆژێ کە وەک ئەزموون و بەسەرهاتی بەشێکی بچووکی پەنابەران لە کانادا، بڵاو بێتەوە.

هەر خۆشیتان، حەسەن شافێعی

**ئاپگرەید:** upgrade [کۆمپیوتەر] berzkrdnewe بەرزکردنەوەی ئاستی ئامێرێک بە زیادکردن یان گۆڕینی پارچە یان چەند پارچەیەک ع رفع مستوی ف ارتقا

⟵ **ئاپدەیت:** upgrade [کۆمپیوتەر] نوێڤەکردن، گەیاندنی زانیاری بە دواین ڕادەی نوێ و مۆدێرن ع تحدیث ف بە روز رسانی.






**ئاپۆرە:** کۆمای خەڵکێکی زۆر و زەبەند پێکەوە، حەشامات.

**ئاتاج:** بەلەنگاز، موحتاج.

**ئاتەگ:** داوێن (داوێنی کێو).

**ئاخ:** خاک.

**ئاژۆ:**❶ لێخور، شۆفێر.

**ئاژۆ:**❷ لک لێبوونەوەی ڕیشە ⟵ ڕەگاژۆ.

**ئاژۆ:**❸ ئالیک، تفاق.

**ئاژووتن:** لێخوڕین ف ڕانندگی.

**ئاسانە:** ئاستانە، دەرگانە، دەرگا.

**ئاسێ:** سەخت ، دژوار.

**ئاشێر:** ئاشەوان ، ئاشگێڕ.

**ئاکار: ڕەوشت.**

**ئالێن دۆلۆن:** ئەکتەر و هونەرپیشەی بەناوبانگی فەڕانسەیی ٦٠ـەکانی زاینیی.

**ئالفۆنیا:** وشەیەکی لێکدراوی خۆمە و واتایەکە لە سەمفۆنیایەکی تاڵ.

**ئاڵەت:** pepper ئیسووت، بیباری هاڕاوی تیژ.

ئاما: هات

**ئامۆ:** ئاشنا، ناسیاگ ⇽ **نامۆ:** نائاشنا، نەناس: ئامۆ و نامۆ.

**ئامەشۆ:** هاتن و چوون.

**ئامێتە:** تێکەڵاو.

**ئامێر:** کەرەسە، ئەبزار.

**ئانیەن:** onion پیواز، پیاز.

**ئاواڵە:** کراوە ، واز ، دانەخراو.

**ئاوەز:** هۆش، ئەقڵ.

**ئاهێر:** ئاگر، تەش. **ئۆگر:** هاودەم.

**ئۆقرە:** ئارام و قەرار.

**ئۆهیپ:** OHIP ڕێکخراوەی بیمەی دەرمانیی پارێزگەی ئۆنتاریۆ لە کانادا.




**ئەدۆنیس:** Adonis لە میسۆلۆژیی یۆنانیدا، نیشانەی سروشت و بووژانەوەی ژیانی ساڵانەیە. ئەدۆنیس گەنجێکی قۆز و دەزگیرانی ئافرۆدیت بوو کە ئارێس ئیرەیی پێئەبرد. ئارێس خۆی ئەکا بە بەراز و ئەدۆنیس ئەکوژێ. لە خوێنی ئەدۆنیس گوڵاڵە ئەڕوێ و ئافرۆدیت خەم دای ئەگرێ. ئافرۆدیت داوا لە بریسفوونە ئەکا ڕێگە بدات ئەدۆنیس هەموو ساڵێک چوار مانگ زیندوو ببێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ زەوی، لەم ڕووەوە ئەدۆنیس هەرچەند تەنها وەرزێک ئەژی، بەڵام بە نموودی ژیانەوەی سروشت دائەنرێ.

  

**ئەز :** من، خۆم

**ئەزبەنی :** گەورەم، من بەندەتم ، من عەبدی تۆ، وشەی ڕیزلێنان .

**ئەزیە :** ئازار.

**ئەساسی :** بنەڕەتی .

**ئەسر :** فرمێسک، ئەسرین .

**ئەسمەر :** بەرهەم .

**ئەشقیا :** یاخی .

**ئەقڵی کول :** ئاماژە بەوانەیە کە لە هەموو بوارەکاندا ، خۆیان بە پسپۆڕ و خاوەن ڕا دەزانن .

**ئەمەگ :** وەفا .

**ئەمەگداریی :** وەفاداریی .

**ئەمەل :** حەز و ئارەزوو.

**ئەودالْ :** ئاوارە ، عەودالْ .

**ئەوک :** گەروو، بەرمل، ئێخە .

**ئەویا :** ئەو شوێنە ، ئەو جێگا .

**ئێڤین :** ناوی بەرزاییەکە لە شاری تاران .

**ئێگزڕسایز :** Exercise ڕاهێنان، مەشق، تەمرین کردن، مومارسە .

**ئیرەم :** ناوی باخێکی بژوێن و دلْڕفێنە لە شاری شیراز کە مێژووی یەک هەزار سالْ بوونی هەیە .

**ئیکسیر :** کیمیا، ئەو دەرمانەی کە کانزاکان دەکات بە زێڕ .

**ئیمان سز :** بێ ئیمان .

**ئینشۆڕانس :** بیمە.

**بابۆز و ئاربەبا:** ناوی دوو شاخن لە بانە.

**باپۆڕ:** هەڵامەت، باپەڕ، سەرمابوون.

**بادر:** bother ئەزیەت کردن، ئازاردان.

**باربیکیوو، چیلّی و سووەسایەد:** ٣ جۆری دۆشاون:

- یەکەمیان ئاسایی
- دووەم تیژە و
- سێیەم زۆر تیژە.

**بارۆشە:** باوەشێن.

**بارۆشەش کەرۆ:** واتە باوەشێنی بکە.

**باژێر:** شار، بازاڕ.

**باسک:** قۆڵ.

**باڵا چەم:** واتە بەژنم چەماوەتەوە.

**باڵجۆینت:** ball joint سیبەک، تۆپی فەرمان. تۆپی فەرمان ڕێگە ئەدا لە تەوەرێکی باشارکراودا جوولان دروست بێ.




**بانداژ:** پێچراوە، (بە نیازی ڕێک و بچووک کردنەوەی لووت یان کەپۆ).

**بانک:** Bank Street نێوی شەقام. ئاماژە بە شوێنی دوکانەکەیە.

**بانیجە:** بانیژە، بانی نزم.

**باوەرۆ:** بهێنەرەوە، بێنەوە.

**باهۆ:** شان و پیل.

**باهۆز:** گێژەڵووکە، گەردەلوول.

**بڕست:** توانایی، هێز.

**برک:** ئێش، ژان.

**برووسکە:** چەخماخ.

**بریکار:** بەرهەڵستکار، دەمڕاست، نوێنەر ف وکیل.

**بڕەوێ:** تەواو بێ، دەرچێ.

**بژیو :** مایەی ژیان، خۆراک، ئەو شتەی پێی ئەژیت .

**بناشت :** گلەیی .

**بۆسە :** کەمین .

**بۆش :** خاڵی، بەتاڵ .

**بوور :** وشک، قاقڕ، بیابان .

**بووست :** Boost وزە، قەوە، هێز، توان .

**بووکەباغە :** لەیستۆک، بووکەڵەی کایە و یاریی مندالآن .

**بوومەلێڵ :** تاریک و ڕوونی ئێوارە و بەرە بەیان .

**بەدەو :** جوان .

**بەختی جۆر :** بەختی هات و لەبار، بەختی مەوافیق .

**بەر :**❶ بەرهەم، میوە .

**بەر :**❷ کەرت، بڕگە، کەردوو، کەرتی بیستان .

**بەرات :** مز، حەقدەست [ف] دستمزد .

**بەرجەوەن :** مەنزەرە، دیمەن، بەرچاوگە .

**بەردەتاشە :** تاشەبەرد .

**بەرژەنگ :** لۆگۆ، نیشان، هیما .

**بەرقاڵ :** وەکوو سەرقاڵ، خەڵک هەیە سەرقاڵە و خەڵکیش هەیە بەرقاڵە...

**بەرێ :** پێشتر، بەرلەوە .

**بەژ :** کیشوەر، وشکانی [ف] [ع] قارە .

**بەستەڵەک :** سەهۆڵبەندان .

**بەستێن :** قەراخ، کەنار، ساحێل.

**بەسشابا :** Bathsheba هاوسەری ئووریای حیتی لە سەردارانی داوود، کە داوود شەیدای ئەبێ و کاتێک ئەزانێ سکی پڕ بووە، تێئەکۆشێ ئووریا دوور بخاتەوە، بۆی ناکرێ، ناچار ئەیکوژێ و بەسشابا لە خۆی مارە ئەبڕێ . سلێمان کوڕی ئەم ژنەیە . تەورات: (سمایل ٦:١١ـ١٣ و شاهانی یەکەم ١:٨) سەربردەی ئەم ئەوینە، بووە بە سەرچاوەی سرووشی زۆر لە شێوەکارانی هەڵکەوتووی جیهان وەک ڕەمبراند، گۆڤێرت فلینک، ویلیەم دۆرست، بێرناردینۆ و زۆری تر لە هونەرمەندان و وێژەوانان .

  

**بەسەرێنی:** لە کات و شوێنی خۆیدا ⇦ **سەرێنی:** کاتی بوونی کەسێک لە دارەت و دۆخێکدا، ماوەی ژیان.

**بەسیت:** (ع) ساکار، سادە.

**بەش:** بەختوهات، چارەنووس، سەرنقیس ف ع قسمت، نصیب.

**بەشق:** لە بۆ خاتری، بە ئەشقی.

**بەشقی:** بە خاتری، بە ئەشقی.

**بەکرۆک:** دووزمان، شۆڤار، گێرەشێوێن.

**بەلەبەلە:** بە گونی خۆ کایە کردن، دەست تێوەردان لە گون.

**بەلەز: بە پەلە.**

**بەلەنگاز:** بی ئەنوا، هەژار، فەقیر.

**بەیشۆر:** نێوی مالێکە (بازاڕ) لە ئۆتاوا.

**بێلا:** Bela نێوی ئەو خاتوونەی کە لە دوکان ئیشی دەکرد و دلّی مەلای بردبوو بۆ خۆی.

**بێن:** بۆن، بەرامە.

**بێوار:** بێبەر، بێ سەمەر.

**بیچم:** شێوە، سەر و سیما.

**بیزنس:** Business پیشە، بازرگانی، کەسب و کار.

**بیستۆک:** تەلەفوون، گووشیی.

**پابەند:** پێبەست و دیل.

**پاندۆ:** Pando لاتین بە واتای ڕەگاژۆ و، هەروەها Trembling Giant یشی پێ ئەوتری بە واتای لەرزانەی زەبەلاح، لە ناوچەیەکی بەرینی دارستاندا، هەزاران درەخت ئەبینرێ کە لە ژێرەوە ڕیشەکانیان لێک ئالآوە و وا دائەنرێ یەک بوونەوەری زیندووە.



**پانیک:** panic یان panique لە میسۆلۆژیی یۆنانیدا پان pan خوای شوان و ڕانە، کە لە ڕوخساری نیوەمرۆڤ نیوەئاژەڵی مرۆڤی سەرەتایی و بزندا پیشان دراوە، زۆر چالاکە و وازێکی سێکسیی زۆر بەهێزی هەیە. ئەچووە بۆسەی پەریانەوە و ئەکەوتە دوایان. ترس لە پان وشەی پانیک (panic) بە واتای ترس و تۆقانی کتوپڕی بەدی هێناوە.




**پایان:** کۆتایی، دوماهی، دوایی: وتەی کوردی پایانی نییە خاڵ هەنبانە بۆرینە.
**پرتەقاڵ:** مەبەست ولاتی پۆرتگەڵ( کابرا خەڵکی ئەوێ بووە )
**پریاسکە:** بوخچەی بچووک.
**پڕ:** زۆر، فرە، خەیلێ.
**پرۆتێز:** Prosthesis پڕکردنەوەی ژێر پێست و لێو و کۆئەندامانی لەش بە مەبەستی جوانکاری.
**پسپۆڕ:** شارەزا.
**پشک:** بەش.
**پشوو:** ئیسراحەت.
**پلوورە:** پلووسک.
**پۆپە:** تەپڵەسەری کەڵەشێر.
**پۆت:** گەرد، خۆڵی ورد، خۆڵە پۆتە.
**پۆک:** وشەی سەیرمان، چەن سەیرە!!
**پۆک:** سەرسووڕماو.
**پووک:** خاڵی، هەڵۆڵ.

**پووان:** پوڕتووکان، پرتووکیان.

**پۆینت:** خاڵ، ئیمتیاز.

**پووره:** دەستە ، کۆمەڵ ، کۆبوونەوە و چڕبوونی هەنگ.

**پەڕتووک:** پەرتووک.

**پەڕتووکی ئاواڵە:** پەرتووکی کراوە.

**پەرجۆ:** دیاردە و کار و بابەتی سەرسووڕهێنەر، موعجیزە.

**پەرەدیس:** بەهەشت، فردەوس،جەننەت.

**پەرێز:** شوینی بۆسەی ڕاوچی، بە ئارامی بەرەو نیچیر ڕۆیشتن.

**پەڕاو:** دەفتەر.

**پەڕگر:** توندڕەو، توندئاژۆ، پەڕگیر.

**پەڕنیان:** کووتاڵی هەورێشمی.

**پەڕیوە:** دوورکەوتوو، دوورخراو، دوورەوڵات.

**پەژ:** تەڕ و تازە

**پەژیوان:** پەشیمان، پاشگەز.

**پەساپەسا:** بێ بڕانەوە، بێ ڕاوەستان.

**پەستان:** زەخت، فشار.

**پەسن:** پێدا هەڵدان، تاریف کردن، مەدح.

**پەسیو:** هەڵامەت ، پەتا.

**پەشک:** دڵۆپ، قەترە.

**پەل:** دەستە، گرووپ.

**پەلتەک:** دەوەنی پاییزیی ، بڕکەی بێستانی پاییز.

**پەنام:** پێوار، نادیار، غەیبیی.

**پەنجەشێر:** شێرپرنجە، سەرەتان.

**پەی:** لە دووت.

**پەیڤین:** قسەکردن.

**پەی کەر:** نیشانەی کە ، نیشانە بگرە.

**پێز:** مادە، ئەسڵ، کێش.

**پیر:** مامۆستا، ڕێ پیشاندەر.

**پێک:** پیاڵەی شەراب.

**پێل:** شەپۆل ، مەوج.

**پیل:** باسک ، قۆڵ.

**پیست:** شوێنی نواندنەکە.

**پیستی مۆتۆڕ:** مەبەست شوێنی نمایش کردنی مۆتۆڕسیکلێتە کە لە سەر دیواری ۳٦۰ پلە.





**تابۆ:** قەدەغە، پاوان.

**تاپۆ:❶** تارمایی، شەبەح.

**تاپۆ:❷** سەنەد، بەڵگە.

**تاخ:** گەڕەک.

**تاسەگا:** شوێنی تاسە.

**تاڤگە:** ئاوهەڵدێر، سۆلاڤ، ئابشار.

**تانووت:** سەرزەنشت، سەرکۆنە کردن.

**تانیتا:** بێ هاوتا.

**تاو:[١]** توان، تابشت، تاقەت.

**تاو:[٢]** هەتاو، خۆر.

**تاوان:** سزا، قەرەبوو، گوناح، پاداش.

**تراز:** ترازوو، میزان، بەرانبەر.

**ترووسکە:** پریشک هاوێشتنی ئاگر، تیشک، بریقە.

**تشت:** شت، هین، وانێک.

**تلّ:** بێهاوتا، تانیتا.

**تنۆک:** دلۆپ، دلۆپە، پەشک.

**تۆبیاس و ڕافایل:** Rafael and Tobias تۆبیت پەیامبەری جوولەکانە، ساراگۆنی دووەم لە ۷۲۱ی پ.ز لە ولاتی خۆی تەرەی کردووە، لە نەینەوا ئەژی. کوێر ئەبێت و کوڕەکەی تۆبیاس ئەبێ بچێتەوە بۆ ولاتی ماد بۆ ئەوەی سامانەکەی

بهێنێ. ژنێکی گەولاز لە ولاتی ماد هەیە کە حەوت شووی کردووە و ئەهریمەنێک بە ناوی ئاسمۆدیۆس مێردەکانی کوشتوە. ڕافایلی فریشتە لە ئاسمانەوە هاتوەتە خوارەوە تا لە ڕواڵەتی مرۆییدا و لەو گەشتەدا یارمەتی تۆبیاس بدات. کە ئەگەنە ولاتی ماد و پێ ئەخەنە چەمی دەچلەوە، ماسییەک پەلاماری تۆبیاس ئەدا، کە بە یارمەتی رافاییل ماسییەکە ئەگرێ و دڵ و جەرگ و کیسەی زەرداوی وەکو دەرمان بەکار ئەهێنێ بۆ ئەوەی ئاسمۆدیۆسی ئەهریمەن دوور بخاتەوە، ژنە بخوازێ و چاوی باوکی چاک بکاتەوە. باوکی تۆبیاس پێی ئەڵێ لە نەینەوا بڕوات چونکە ئەو شارە کاول ئەبێ!

تەوڕات پەرتووکی تۆبیت **٥- ٥و٦ و ٦- ٢تا٩**







**تۆپ:** گون.

**تۆپەوان:** خاوەن گون.

**تۆخ:** ڕەنگی تێر، پڕ ڕەنگ.

**تۆرەمە:** بەرە، نەسل، نیژاد.

**تۆک:** تۆخ، تویکڵ، تۆخڵ.

**تۆم:** توو، توخم.

**توێشوو:** خواردەمەنیی ناو ڕێگا.

**تەتە:** بووکەڵە قوڕینە.

**تەوان:** توان، توانایی.

**تەرگ:** تەرزە، تەگەرگ، تگرگ.

**تەرم:** لاشە، جەنازە.

**تەرە:** ئاوارە، بەجیماو.

**تەریک:** بێ نەسیب، گۆشەگیر، دەست بەتاڵ.

**تەڕلان:** باز، هەڵۆ, شۆخ و شەنگ.

**تەڕەشۆ:** شێدار، نمدار.

**تەز:** سەرما.

**تەژە:** دریژ، بالابەرز.

**تەژی:** پڕاوپڕ، لێپاولێپ.

**تەش:** ئاگر، گڕ.

**تەشک:** بیچم، بەچک.

**تەشە:** تابشت، تاقەت، توان، ئارام، ئوقرە ف ع صبر، حوصلە.

**تەشی ئەشق:** ئاگری ئەڤین، گڕی ئەشق.

**تەک:** لەگەڵ، لەتەک.

**تەڵزم:** تۆڵاش.

**تەمتەمان:** زەوی پر لە بەرد.

**تەنا:** ئاسوودە، تەناهی.

**تەوار:** هەڵۆی مێ.

**تەوان:** توان، توانایی.

**تەوس:** توانج، تەشەر.

**تەوسەن:** تۆسن، بەدفەڕ.

**تەون:** تۆڕ، ئەوەی فەڕشی لە بان دەچنن.

**تەوێڵ:** ناوچاوان.

**تەیر:** باڵندە، پەلەوەر.

**تێن:** تینوو ، گەرما.

**تیپ:** Tip دەسخۆشانە، پیتاک، ئەنعام، بەخشش.

**تیرێژ:** تیشک.

**تیلرسن:** Rex Tillerson سەرۆکی باڵای ئێکسۆن مۆبڵ و ناودێری وەزیری ناوخۆی داهاتووی ئەمریکا.

**جان:** گیان.

**جحێڵ:** گەنج، جەوان.

**جخار:** جەخار، خەفەت.

**جەمین:** تەوێڵ، ناوچاوان.

**جووس:** Juice ئاوی میوە و سەوزە.

**جەرد:** مشک.

**جەغز:** بازنە، ئاڵقە، دایرە.

**جەمە:** خاتوونی نێو شیعرەکە.

**جەنجەڕ:** کەرەسەی لە بیر ئاودەرهێنان کە وەکوو چەرخ سازی دەکەن و ئاوی پێ هەڵدەگۆزن.

**جەفەنگ:** شۆخی.

**جەنەراڵ تاونزێند:** Lt. Gen. Stephen J. Townsend فەرماندەی ناردەی کۆشکی سپی ئەمریکایە لە سووریە.

**جەریب:** یەکەی ئەندازەیە بەرانبەر بە هەزار میتری سێجا.

**جیز:** گوێز.

**چاتۆڵ:** داوەڵ، هەراسە، (مَتَرسک) ف

**چالە:** گۆڕهەڵکەنە.

**چامە:** هۆنراوە، هۆزان، شیعر.

**چانکایا:** فەرمانگەی ڕاپەڕاندن و ڕامیاری دەسەڵاتی تورک لە ئانکارای پێتەختی تورکییە.

**چاوەش:** musician ١) دەهۆڵ و زوڕناژەن ٢) شاییگێڕ، شایەر ٣) پێشەنگی لەشکر و پێشڕەوی کاروان ع موسیقار N musiker ف مطرب.





**چاییگ:** تەزیو، زۆر سارد

**چرۆ:** گۆپکە، جەوانە.

**چرین:** بانگ کردن، قاوکردن.

**چلچەمە، مێرگەنەخشینە، وەنەوشە و نەکەرۆز:** لە شاخ و کێوەکانی واری شارستانی دێرینی سەقزن.

**چلوورە:** پارچە سەهۆڵی شۆڕەوە بوو لە گوێسوانان.

**چما:** هەر دەڵێی

**چەش:** مەزە، تام.

**چەقەڵ:** شوغاڵ.

**چەک:** داماڵینی سیلاح، داماڵینی چەک [ف] خلع سلاح.

**چەل:❶** دەرفەت، نۆبە، نۆرە، جار، هەل، کەرەت.

**چەل:❷** نۆبە، نۆرە، نۆرەدانەوەی یاری بەو کەسەی دۆڕاندبێتی، دەرفەتی دووهەم (Second Chance)

**چەم:** چاو، دیدە.

**چەما:** نووشتایەوە.

**چەمان:** چاوان ⇐ چەم: چاو.

**چەمانرێ:** چاوەڕێ.

**چەمک:** Concept, notion کۆی ئەو تایبەتمەندییە هاوبەشانەی نێوان شەمەک و ئەندێشەکانە کە ئەبێتە هۆی تێگەیشتن لە هەر دیاردەیەک. بۆ هەر چەمکێک وشەیەک هەیە. بۆ نموونە، وشەی «مرۆڤ» زاراوەیەکە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو چەمکەی کە مرۆڤێک ئەوەیە. هەموو ئەو شتانەی کەسێک لەبارەی مرۆڤێکەوە ئەیانزانێ، ئەبنە چەمکی مرۆڤ. لەوانەیە چەند زاراوەی جیاواز ئاماژە بۆ یەک چەمک بکەن، بۆ نموونە، «ترێ» و «هەنگوور» هەردووک ئاماژە بە یەک چەمک ئەکەن. لە ڕوانگەی فەلسەفییەوە، چەمکەکان پێکهێنەی ئەندێشە و بیرۆکانن. کەوابوو، لە پرۆسەگەلی سایکۆلۆژیکدا وەک پۆلاندن و هەڵهێنجان و هاتنەوەبیر و فێربوون و بڕیارداندا گرنگییەکی ئێجگار زۆریان هەیە [ع] مفهوم [N] Konsept [ف] مفهوم.

**چەو:** وردەبەردی قەراخ چەم و دەریا، زیخ و چەو [ف] شن و ماسە.

**چەیس:** دوای کەسێک یان شتێک کەوتن، تەعقیب.

**چێژ:** تام، مەزە.

**چێڵ:** مانگا.

**چیکن وینگز:** chicken wings باڵە فڕووج.

**حەریب:** شەلیاو، کەسێ کە سامان وماڵی تالآن کرابێ، بێئەنوا، وەبەر شالآوی شەرکەوتوو.

**حەسار:** حەوش.

**حەلیم و ئەترەش و کولسووم:** سێ گۆرانیبێژی گەورەی عەرەب.





**حەوانۆ:** ئارامیان گرت.

**خامە:** پێنووس، قەڵەم.

**خشڵ:** مت و مووروو، جەواهێرات.

**خۆن:** خۆمان، خۆمانە.

**خۆیا:** دیار، ئاشکرا، بەرچاو.

**خوان:** سفرە.

**خورت:** کوڕ.

**خول:** حۆل، گێژ، بێ ئاگا.

**خوناوە:** ئاونگ، شەونم.

**خونکار:** بەرزترین شوێنی بڕیار و دەسەڵات، حاکم.

**خەزەڵ:** گەڵا، بەرگ.

**خەزێنە:** گەنج.

**خەستە:** هیلاک، ماندوو، نەخۆش

**خەلیجی:** ئاڕایشت وخۆ جوان کردن بە شێوازی وڵاتانی خەلیج.

**خەمڵ:** ڕازاندن، ئاڕایشت.

**خەمڵاوە:** ڕازاوەتەوە، جوان بووە.

**خەنی:** شادمان، دڵخۆش، خۆشحاڵ.

**خێو:** خاوەن

**داوەڵ:** داهۆڵ، هەراسە ف مترسک.

**داخ:** کێو.

**ددانی ئاوی:** مەبەست لە بلووتووتە Bluetooth.

**دراو:** پووڵ، پارە.

**درایڤێر:** شۆفێر، ئەو کەسەی ئۆتۆمۆبیل لێ دەخورێ و پیتزا دەباتەوە.

**درک:** چقڵ.

**دزێو:** دشت، ناحەز، ناشیرین.

**دلڤاڵ:** دڵ گەورە، سینگ فراوان.

**دلۆرە:** ڕاکشاو، پاڵکەوتوو.

**دلۆڤان:** مێهرەبان.

**دڵگەرەک:** دلخواز.

**دڵمەند:** دڵگران، دڵ ئێشاو.

**دلۆ:** پێستی داماڵدراوی دەست.

**دۆت:** کچ، کەنیشک، کیژ.

**دۆزەخ:** جەهەننەم.

**دۆزەغەرە:** ناوی ئاواییکە لە نزیکی شاری سەقز.

**دۆژەنگ:** تێکهەڵچوو، چرچ و لۆچی ناوچاو.

**دۆسیە:** پەروەندە، شکایەت، سکالانامە.

**دووان:** قسەیان کرد.

**دوورپەرێز:** لە خەڵک دوور کەوتوو.

**دووش:** نورویژی Dusj و ئاڵمانی Dusche، بە ئینگلیزی ئەکاتە Shower واتە خۆشۆردن لەبەر کەرەستەیەکی کونکون کە وەک باران ئاوی لێ دێتە خوارەوە.

**دوومان:** دووکەڵ.

**دەستەڕۆ:** دەسەوسان، بێدەسەلات.

**دەغەزار:** گیاندار و درەختی لاواز و لەڕ.

**دووروین:** کامێرا، دووربین.

**دوورپەرێز:** گۆشەگیر، هەردەوێڵ، لە خەلک دوورکەوتوو.

**دوومان:** دووکەل.

**دۆ:** هاوسەما، کچ.

**دەر:** درگا، دەرگا.

**دەلال:** شۆخ و دڵڕفێن.
**دەساژۆ:** دەستەمۆ، کەوی.
**دەستان:** داستان.
**دەستەڕۆ:** بێ دەسەڵات.
**دەش:** دیمەنی جوان.
**دەغەزار:** گیاندار و درەختی لاواز و لەڕ.
**دەم:**❶ زار، دەڤ.
**دەم:**❷ هەناسە، نەفەس.
**دەم:**❸ سات، چرکە.
**دەماخ:** مێشک.
**دەنگۆ:** شایەعە، بڵاوکراوە.
**دهۆ:** فێڵ، حیلە.
**دەوڵەت:** سەروەت، سامان، دارایی.
**دەوی:** بنچک، منج ، دەوەن.
**دهۆک:** ئەمازەیە بە کۆنفرەنسی سەربەخۆیی کوردستان، دێسەمبری **٢٠١٦** لە دهۆک، کە سێ کەسایەتیی ئەمریکایی بە ناوی جەنەڕاڵ تاونزێند، مەکگورگ، تیلەرسن تێیدا بەشدار بوون، بەڵام هیچکام لە بڕیارەکانی ئاشکرا نەکرا.
**دێمەحاڵان:** مەبەست لەوانەیە کە وشکەسۆفین، وشکحاڵ. ئاماژە بە باری دەروونیی ئەو دوو برادەرەیە کە هەست بە پیریی دەکەن و تین و گوڕی گەنجییان نەماوە و، دیمە حاڵن واتا، حاڵیان وشکە (دێمە). و وەک جاران، تەڕ نەماوە.
**دێمە کاڵان:** ناوی گەڕەکێکە کە لە ناوەندی شاری سەقزدا هەڵکەوتووە و مزگەوت و کانییەکەی بە ناوبانگ بووە.
**دێنیز:** ناوی سەگە وردیلانەکەی کاک ڕامین مەرزبان هاوڕێی خۆشەویست کە ژیانی کۆتایی پێهات.
**دیاردە:** phenomenon دەرکەوتە، ڕۆژەڤ یان دۆخێک کە ڕوودانی بوویەرێک پیشان ئەدا، بەتایبەت نموونەیەک کە جێگەی پرسیارە یان ڕاڤەکردنی دژوارە [ع] ظاهرة [ف] پدیدە.
**دیتەیڵ:** وردەکاری.
**دیسچارج:** ئازاد، لە تۆمەت پاکەوە بوون.
**دیمە:** گۆنا، ڕوخسار.
**دیە:** دیدە، چاو، چەم.

**دەلال:** شۆخ و دڵڕفێن.

**دیواری مەرگ:** ئەو شوێنە بوو کە مۆتۆڕسیکلێت بە دەوری دیوارێکی گرد و بەرزدا دەسووڕایەوە و بەو شێوە، خەڵکی سەرسام دەکرد.



**ڕابوون:** هەستانەوە، بەرزبوونەوە ف قیام.

**ڕابێ:** هەستێت، قیام بکات.

**ڕایەخ:** ڕاخەر، فەڕش.

**ڕاژۆر:** مەجلیسی خونکاران، شوێنی دانیشتنی بڕیاردەرە سەرەکییەکان.

**ڕاژێر:** ژێرڕاخەر، باشوور ف جنوب.

**ڕامیار:** سیاسیی، سیاسەتباز.

**ڕاوان:** وڕینە، ژاوەژاو.

**ڕدێن:** ڕیش.

**ڕژد:**[١] پەست.

**ڕژد:**[٢] چاوچنۆک، بەرچاوتەنگ، بەخیل.

**ڕژد:**[٣] چرووک، سەخت.

**ڕکە:** هەودەک، قەفەس.

**ڕمان:** ڕووخان.

**ڕند:** جوان، شۆخ.

**ڕنوو:** هەرەس.

**ڕۆ:** ڕۆژ.

**ڕۆخ:** لێوار، قەراخ.

**ڕۆزە:** چرچ و لۆچ.

**ڕۆژمێر:** ڕۆژژمێر.

**ڕۆژەڤ و ڕاستەقینە:** ڕۆژەڤ یان واقیع ئەو دارەت و دۆخەیە کە بەبێ پێخۆشبوونی ئێمە هەیە و؛ ڕاستەقینە یان حقیقەت، ڕۆژەڤی بەدیهاتوو یان بە ئەنجام گەیشتوو، واتە سەنتزی بەرەنجامی جەنگی تێز و ئانتی تێزە لە ڕۆژەڤدا. چەند لامان سەخت بێ و چەند پێمان ناخۆش بێ ڕۆژەڤی مرۆڤ ژیانە و ڕاستەقینەی مرۆڤ واتە سەنتزی بەرەنجامی تێز و ئانتی تێزی بەرگری و خۆبەدەستەوەدانی شانەکانی لەش، نەمانە. بیرسا: لۆجیک.

**ڕۆناهی:** ڕووناکی.

**ڕوێز:** عوزر و بەهانە، گومان.

**ڕووتەن:** زەمینی وشک و بێ گژ و گیا.
**ڕووگە:** قیبلە، شوێنێ کە ڕووی تێدەکەین.
**ڕوومەیت:** Roommate هاوماڵ، هاووەتاغ، هاودیو.
**ڕەبەن:** سەڵت.
**ڕەبەنۆک:** بەڕەزا، ئالالە.
**ڕەچەتە:** نوسخەی دوکتور، دەستووری بەکار هێنان.
**ڕەزا پالانی:** ڕەزا قەزاق، ڕەزا ماکسیم، سەردار سپا، کە وەکوو دارەدەستی ئینگلیس کوودتای لە دەسەلاتی قاجاری تورکی ئاغوز کرد، بە ناوی ڕەزا شا دەسەلاتێکی دامەزراند کە پاشتر پاشناوی پەهلەویان پێوە لکاند. لە **١٩٢٥** تا **١٩٤١**ی زایینی. ڕەزا قەزاق کە هەتیو بوو و بە هەژاری گەورە ببوو، هیچ ناو و نیشانێکی نەبوو. ڕاوێژکارەکانی بە باشیان زانی ناوێکی بۆ هەڵبژێرن شیاوی پادشا بێ. بۆ نموونە **ڕەزا پالانی** واتە **کورتاندروو**یان کرد بە ڕەزا پەهلەوی گوایە، کۆلکەی بگاتەوە بە پەهلەوییە ئەشکانی و ساسانییەکان. ئیتر لەوە بگەڕێ ئەو چوار ملیۆن پەهلەوییە کە ماون و ئێستە هەن، هەر هەموویان کوردن و بە شانازییەوە خۆیان بە کورد ئەزانن.

یەکێک لەو کەسانەی چیرۆکەکەی دەنگی دایەوە **مەحموودی پەهلەوی** نووسەری بەناوبانگ و خاوەنی پەرتووکی هەشت بەرگی **مێژووی پەیوەندی ڕامیاری ئێران و ئینگلیز** بوو. کاتێکە ناوەکەیان لێ سەندەوە، وتیان ناوێکی تر هەڵبژێرە. ئەویش وتی جا کە ناوی خۆم بە کەڵەگایی لێبسێنن و نەتوانم هیچ بکەم، دیارە بەس مەحموودم و لەوە زیاترم شیاو نییە. لەو ڕۆژە بە دواوە، مەحموودی پەهلەوی، بوو بە **مەحموود مەحموود!**

ڕەزا خان کە تەنها خۆی و کوڕەکەی محەمەد ڕەزا پادشاییان کرد و، کوڕەکەشی هەمان چارەنووسی خۆی هەبوو، واتە سەرەتا دایان نا و پاشان لە وڵات دەریان کرد، گەورەترین زیانیان لە فەرهەنگی ناوچەکە دا و نەک هەر ناسنامەی خەڵکیان بە ئاشکرا دزی، مێژووشیان سەر لە نوێ نووسیەوە.

وشەی ئێران کە تا ساڵی **١٩٣٥**ز بۆ ناوی ناوچەکە و نەتەوە ئێرانیەکان بە تایبەتی کورد و ماد بەکار هێنرابوو، نەک بۆ سیستەمێکی حکوومەتی، دزییان و حکوومەتەکەی خۆیان ناو نا ئێران. لە دەیان هەزار سکەی زێڕ و زیو و ئاسن کە دۆزراوەتەوە تەنها یەک دانەیان، لە هیچ سەردەمێکدا، وشەی **ئێران**ی لەسەر نەنووسراوە. ئەوسا کەوتنە نووسینی مێژووی **٢٥٠٠** ساڵە، ئەو زنجیرە حوکمدارییانەی تورک و تەتەر و غوز و ئوزبەک و مەنگول و گوورکانی و سلووکی

و هەموو جۆرێکی تیایە، فارس نەبێ.

ئەم پڕۆسەیە تەنها لە بواری ناسنامە و مێژووەدا نەبوو. ڕەزای هەتیو کە هیچی نەبووە و بە منالّی، لەبەر نەداری، نەخۆش ئەکەوێ و لەسەر ڕێگە فڕێی ئەدەن و خێرەومەند هەلّێ ئەگرنەوە، لە ماوەی ١٦ سالّ پاشایەتی خۆیدا، تا ئەو ڕۆژەی کە هەمان ئینگلیس کاری پێی نەما و نەک هەر شاربەدەر بەلّکوو ولاّت بەدەری کرد، **حەوت هەزار** گوندی لە دەس خاوەنەکانی دەرهێنا و کردنی بە ناوی خۆیەوە. ئەمە جگە لە سەدان کۆشک و کارگە و دامەزراو و... ☜ داریووش.








**ڕەند:** جوامیر.

**ڕەنگالّە:** ناوی مەلێکی ڕەنگاوڕەنگە بە قەد ڕیشۆلّەیەک ئەبێ.









**ڕەنگامە:** ڕەنگاوڕەنگ.

**ڕەوی:** ڕۆیشت، نەما.

**ڕەویی تاوی تاو:** واتا، توان و تاقەتی تاو و گەرمام نەماوە.

**ڕێژن:** بارانی زۆر، فراوانی و بەرەکەت.

**ڕێژنە:** تاوەباران.

**ڕینگاڵ:** شەربەت.

**ڕێوار: ڕاگوزار.**

**ریلەیشن:** relation پەیوەندیی.

**ریمۆت:** ئەو ئامێرەی وا لە ڕێی دوورەوە شتی پێ چاوەدێریی، یان کۆنترۆڵ دەکەن.



**زار:** زمان.

**زارۆک:** منداڵ.

**زایەڵە:** دەنگی شین و گریان، دەنگدانەوە، ئاواز.

**زراو:** شووشو باریک، ڕێک و پێک.

**زگار:** مەلوول، ڕەنجاو، دڵ ئێشاو.

**زنار:** تاشەبەرد، بەردی گەورە.

**زنە:** مێرگوزار، گیاجار، چیمەنی تەڕ.

**زوڵفە:** کورتکراوەی زوڵفەقاڕ. مەبەست، شمشێری دوو فلیقانەیە کە بۆتە نازناوی گۆران.

**زۆخ:** قووەت، توانایی.

**زوێن:** پەرێشان.

**زویر:** دڵئێشاو، ڕەنجاو، تۆراو.

**زوور:** خەمگین.

**زەریبە:** Tax باج، ماڵیات.

**زەمهەریر:** سەرمای تووش، شالاوی سارد.

**زەن:** زیندوو.

**زەنا:** هاوار، فریاد.

**زەناو:** گۆمێکە لە چەمی زێڕینە یان چەمی سەقز.

**زەنگین:** دارا، دەوڵەمەند.

**زێ:** جۆگەئاوی گەورە، گۆل، دەریاچە, زەریا.

**زێد:** شوێنی لە دایک بوون.

**زێدەوان:** نیگابان یان ئێشکچی گۆڕستان.

**زیز:** تۆراو.

**زیقە:** زریکە، قیژە و هاوار.



**ژاڵ:** سەم، ژەهر، ژار، تاڵ.

**ژانووس:** Janus جانیوەری (ئەم مانگی یەکی ٢٠١٧)، لە ئەفسانەی ڕۆمیدا خوای سەرکەوتن بوو. لە پەرستگەی ژانووس کە دوو دەرگای بەرەو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا هەبوو، پەیکەری ژانووس دانرابوو بە دوو ڕوخساری پیر و جەوانەوە. ئەو دوو ڕوخسارە یەک بۆ پێشەوە یەک بۆ دواوە، یەک لە ڕابوردوو و یەک لە ئایندەی ئەڕوانێ.





**ژانی گەدە و با:** فشەکردن، بای زگ دەرکردن.

**ژاوەبێژ:** ژاوەژاوکەر، هەڵەبێژ.

**ژۆرژێت و کایزە:** دوو جۆر کووتاڵی زۆر ناسکن.

**ژیگ:** زیگ، پەرتووک یان زانستی ڕێسای ڕێکخستنی ئەستێرە و لێکۆڵینەوە لە گەڕ و ناوەندی هەسارە و ئەستێرە و داڕشتنی ڕۆژژمێر؛ سەرەتا ژێ بووە و ژێ واتە دەزوو و، ژێ کە تان و پۆی کووتاڵی پێکهێناوە وەکوو خشتەی نەخشە لە کارگەی چنیندا بەکارهێنراوە. ژیگ یان زیگ لەوێوە بە واتای خشتەکانی ڕێسای ئەستێرەناسی وتراوە. سەبارەت بە ژیگ یان زیگ لەو زمانەی فارس پێی ئەڵێن پەهلەوی یان فارسی ناوەڕاست، **هیچ** ئەماژەیەک بۆ زیگ نەهاتووە و ئەم گۆڕانکارییانە هەمووی لە سەردەمی کوردی ساسانیدا ڕووی داوە. زیگی گەورە یان ژیگی شالیار، لەسەردەمی نەوشیروانی ساسانی،ساڵی ٥٥٥ی زاینی بەرهەم هێنراوە. عەرەب ژیگی کردووە بە زیج. ژیگ چووەتە ناو زمانی یۆنانی و لاتینی سەدەکانی ناونجی و بووە بە زیک یان ئەزیک. هەروەها هۆزێکی کوردان هەیە بە ناوی **زیگ** کە تا ئێستاش لە ناوچەی **کۆهـ کیلویە**ی لای شیراز

ئەژین [ع] [ف] الاسطرلاب، ابراج [E] Astrolabe.





**ژیلەمۆ:** ئاوری بن خۆڵەمێش.

**ژیوار:** مایەی ژیان، ئەوەی کە پێی بژیت، مایەی حەیات.

**ژاوەژاو:** هەڵیت و پەڵیت.

**ژەمەن:** مایەی ژیان، قووت.



**سابات:** کەپر، کەپری هاوینی.

**ساحیلی:** نێوی شەقامیکە لە شاری سەقز.

**سارێژ:** خۆشکردنەوەی برین.

**ساس:** دۆشاو.

**ساکار:** سانا، سادە.

**ساماڵ:** ساو، سایەقە، ئاسمانی ڕووناک و بێهەور ⇦ ساماڵ و ساو و سایەقە: هەرسێک بە واتای ئاسمانی بێهەور و ڕوون و پڕئەستێرەی بەزریوەن، بەڵام ساماڵ لە کاتی هەواخۆشی و ساو و سایەقە کاتی سەرما و سەهۆڵبەدانە کە شەختەی لەگەڵە.

**ساو:** ساف.

**سایکۆ:** کەسی کە باری دەروونی ناسازە، شێت.

**سپڵە:** ناسپاس، پێنەزان.

**ستەیک:** تیکەی گۆشت.

**سرووش:** سەرۆ، دەم، گۆوار، بەدڵدا هاتن، ئیلهام.

**سکانگ:** بۆگەنکە، فسۆس.

**سکاڵا:** ڕازونیاز، شکایەت.

**سڵ:** خۆلادان، دەرچوون.

**سمکۆڵ:** پێکۆڵ، پێ لە زەوی دان، پێ بە عەرزدادانی ئاژەڵ.

**سەنگ و سووژن:** دەستەواژەیەکە بۆ گەڕان و پشکنینی ورد بە کار دێت.
**سۆ:❶** سوێ، ڕووناکیی ⟵ **سۆ:❷** ئێش و ئازار، دەرد، ژان.
**سۆزانی:** قەحبە، لەشفرۆش.
**سۆلاڤ:** ئاوهەڵدێر، تاڤگە.
**سۆڵ:** سۆڵە، سەرمای زۆر و تەزێنەر.
**سۆما:** ڕووناکی چاو.
**سوا:** مامۆستا، وەستا.
**سوان:❶** واتە مامۆستان، لێزان و پسپۆڕ.
**سوو:** جەریمە وشکایەت.
**سووان:❶** کول بوون، لە کار کەوتن ⟵ **سووان:❷** وەستان، (سوا:وەستا).
**سووچ:** هەڵە، خەتا.
**سوون:** ساوین، سوینەوە.
**سوێنک:** سوێنکە، وەردەی کەشک و سابوون و لەو بابەتە. لێرەدا مەبەست سوێنک کەشکێکە کە سوێندراوەتەوە و دۆی پێوە نەماوە و چەند بیسوویتەوە، پاتەکردنەوەی بێسوودە.
**سوێنک سوون:** ڕەخنەی وەک پرتەوبۆڵە، کاری بێهوودە.
**سەجادە:** بەرماڵ.
**سەحەرخیز:** زوراب، ئەو کەسەی بەیانیی مەلابانگدان هەڵدەستێ لە خەو، بەیان ئەنگێو ف سحرخیز.
**سەدەف:** پیشۆک، (صدف)ف.
**سەرا و مەرخوز:** ناوی دوو ئاوایی بەناوبانگی شاری سەقز.
**سەرهات:** ڕەوایەت، بەسەرهات.
**سەرێنی:** کاتی بوونی کەسێک لە دارەت و دۆخێکدا، ماوەی ژیان ⟵ **بەسەرێنی:** لە کات و شوێنی خۆیدا.
**سەما:** هەڵپەڕین، ڕەخس.
**سەما:** ئاسمان.
**سەنتێری کانگرێس:** مەبەست سەنتەری کۆنگرەی کانادایە لە ئۆتاوا ـ هاڵ.
**سەودا:** مامەڵە، گۆڕینەوە.
**سەنگ:** بەرد ⟵ دڵی سەنگ: دڵی وەکوو بەرد.
**سەیزان:** wine cellar سەرداڤ، سیاچاڵ، ژێرخانی شەراب ع ف سرداب.





**سەیک:** Sake وشەی ئینگلیسییە، بەشقی، بە خاتری.

**سێ:** سێبەر.

**سێڵفۆن:** تەلەفوونی هاورێ.

**سیا:** ڕەش.

**سیز (سیزیی):** دەرزی.

**سیگناڵ:** هیما، عەلامەت، ئیشارە.

**سیلە:** گۆشەی چاو، نیشانەگرتن.

**شاداو:** تەڕ وتازە.

**شاری قومار:** ئاماژەیە بە شوێنی یاریکردن لە شاری تاران (شهر بازی).

**شاڵاو:** هێرش، سێڵاو.

**شام:** شەو، تاریکایی، تاریک.

**شاور:** Shower دووش، ئاوبەخۆداکردن.

**شلەنگ:** سۆندە، شلینگ.

**شنە:** دەنگی هەناسەسواربوون، هەناسەی هیلاک

**شۆ:** شێ، تەڕایی، نم.

**شۆت:** «شیر»ی خواردنەوە، ئاماژەیە بە ڕەنگی سپیی تۆخ.

**شۆرەکات:** بیاوان، زەوی سوێر و بێ گیا.

**شۆڕابە:** ئاوی باران.

**شۆک:** داماو.

**شۆن:** شوێن.

**شوورە:** حەسار و دیواری قەڵا.

**شەپڵە:** tremor (شەپڵەلێدان)، لەرزە، گۆجبوون بە هۆی کەوتنە ناو خولگەی کارەبایی هەرووەبرووسکەوە، کە ئەو لێدانە ئەگەر کەسەکە نەکوژێ، دەست یان قاچی بە جۆرێک گۆج ئەکات کە دەسەڵاتی بە سەریاندا نامێنێ و بەبێ ئەڤان رایان ئەوەشێنێ.

  

**شەتاو:** بەفراو، سارداوی بەخوڕی شاخ.

**شەختە:** سەهۆڵبەندان، سەرمای پایزیی.

**شەختەبەند:** سەهۆڵبەند.

**شەربەتی مێوژ:** بەفری ئاربەبایە، مێوژی چوارتایە، خەستە و خوڕەی نایە، لە کووپەکەی دەر نایە، شەربەتی عەلی دەروێش مستەفایە، ئەخۆیەوە بۆت تێکەم بە بەلاش؟ ئەمە بانگەوازی «عەلی دەروێش مستەفا» بوو لە شاری بانە کە شەربەتی مێوژەکەی بێ وێنە بوو.

**شەرزە:** ئازا، نەبەرد، جەنگیی، شەڕانیی.

**شەڕاشۆ:** شەڕکەر، شەڕانی.

**شەقڵ:** مۆر.

**شەقوول:** هێلکەگون.

**شەکەت:** هیلاک، ماندوو.

**شەوە:** ئاڵ.

**شەیک:** Shake ئینگلیسییە، شەکاندن، تەکان.

**شێنە:** لە سەرەخۆ، ئەسپایی، شێنەیی، بەکاوەخۆ.

**شێف:** کێلاّندن.

**شیر:** شمشێر.

**غەور:** ژەنگ.

**فاقۆکە:** داوی بچووک.

**فاک:** Fake فەیک، قەڵب، نارەسەن، ساختە.

**فرسەند:** داد، ڕەوایی ع ف انصاف E impartiality.

**فەراگەرد:** دەور و بەر.

**فەراگەرد:** Environment دۆر، دۆرمادار، کشتوکەنار، دەوروبەر ئەو نەواقەی کە مرۆڤ یان ئاژەڵ یان گیا تێیدا ئەژی ع بیئة ف محیط.

**فەراهەم:** گرد و کۆ، ئامادەکراو.

**فەرتەنە:** ئاژاوە (نانەوە)، گێچەڵ، وەیشوومە.

**فەشن:** مۆد، مۆدە.

**فەیک:** Fake فاک، قەڵب، ، نارەسەن

**فیمەیڵ:** مێیەنە، مێ.

**ڤیز:** ئیفادە، لووت بەرزی.

**ڤالە:** شوێنی چۆڵ و نائاوەدان.

**ڤەژین:** ژیانەوە، زیندووبوونەوە، سەر لە نوێ ژیانەوە.

**ڤیان:** خۆشەویستی، مێهر.

**قات:** شتێک کە دەست ناکەوێ، دیار نەماو.

**قاقڕ:** بیابانی وشک و بێ ئاو.

**قاقرستان:** شوێنی وشکهەڵاتوو.

**قامووس:** فەرهەنگ.

**قز:** کەنیشک، کچ، دۆت ( وشەی ئازەری یە ).

**قل:** دانە، یەک.

**قوڕنە:** گۆشە، سووچ، زاویە.

**قەریب:** نزیک.

**قەقنەس:** یان سیمورگ، مەلێکی رەنگاوڕونگ و زۆر خۆش ئاوازی ئەفسانەییە. ئەڵێن هەزار ساڵ ئەژی و کە ئەگاتە ساڵی هەزار و کۆتایی تەمەنی، لەسەر کێوێکی بەرز ئێزنگێکی زۆر کۆ ئەکاتەوە و لەسەری دائەنیشێ و دەس ئەکا بە خوێندن و باڵ راوەشاندن کە لە ئەنجام دا سەرخۆش ئەبێ و پزیسکەیەک لە باڵیەوە ئەکەوێتە ناو ئێزنگەکە، ئاگرێکی گڕەمەشخەڵان ساز ئەبێ و قەقنەس خۆشی لەو ئاگرەدا ئەسووتێ. لە ژێڵەمۆی بن خۆڵەمێشەکەی هێلکەیەک بەدی دێ و قەقنەسێکیتر. قەقنەس یان سیمرگ یان ٤ عَنقا جووتی نییە و ئەڵێن مووزیک لە ئاوازی قەقنەس وەرگیراوە.

  

**قەلاچۆ:** لە نێو بردن.

**قەمەر:** (ع) مانگ، هەیڤ.

**قەنج:** جوان.

**قەنەفە:** مۆبل، کورسیی.

**قیرسیچمە:** لاسار، خۆڕا، سەرخەر، کەلەڕەق.

**کاپەک:** کەپەک، سقی، کرپک، کەفەک،کەڕوو.

**کارتێل:** Cartel جۆرە دامەزراوێکی ئابوورییە، لە کۆمەڵەی ئەو کۆمپانیانە پێک هاتووە، ڕێ ئەکەون بە یەکخستنی نرخی فرۆشی کاڵا، تا دەسەڵاتی خۆیان بەسەر بازاڕێکی تایبەتدا بسەپێنن. لای کارتێل گرنگ نییە ئەندامانی بە چ شێوەیەک کەرەستەی خاو دەست ئەخەن، تەنها گرنگ نرخی دیاریکراوی فرۆشتنە. جۆرێکی تری کارتێل تراست Trust ـە کە پەیوەندییەکی تۆکمەتریان هەیە، پاژی کۆمپانیاکان لە لای تراستە و ئەبێ هەم کەرەستەی خاو و هەم نرخی کڕین و فرۆشیان لە چوارچێوەی پەیڕەوی «تراست»دا بێت.










**کازێوە:** (کات زێوە)، دەمەوبەیان، سپێدە.

**کاژەنگ:** بزار، بزارکردن.

**کالانە:** کاسەی چاو.

**کامپلیکەیشن:** complication ئاڵۆزی.

**کامیوونیتی:** community کۆمەڵگا، جڤاک.

**کاو:** کام، هیوا، حەز و ئارەزوو، ئەمەل.

**کاوان:** ملە.

**کاوێژ:** جاوین و جوونەوەی خۆراک و خواردووی گەڕاوە بۆ ناودەم. مەبەست

بابەتێک زۆر دووپات و چەندپات کردنەوە، لە سەر قسە زۆر ڕۆشتن.

**کتک:** پشیلە.

**کرک:** بیاوان، دەشتی وشک و بێ ئاو.

**کرمۆک:** خشڵێکی ژنانە، کرمکە.

**کڕ:** خامۆش، ئارام، بێدەنگ.

**کڕنۆش:** چەمانەوە، تەعزیم.

**کز:** داماو.

**کلۆج:** کلۆنج، چەشن، جۆر.

**کڵ:❶** سوورەوەبوو، داگیرساو.

**کڵ:❷** گەشاوە.

**کلۆڵ:** چارەڕەش.

**کۆراڤ:** ئاوی قوڕاویی، سەرچاوەی لیڵ.

**کۆڕ:** Choir کۆڕاڵ.

**کۆک:** قورمیش کردن.

**کۆلوو:** ڕیشەو گیای وشک وتێکپێچراوە.

**کۆ(م):** واتە، ئامادەم، خۆم کۆ کردووەتەوە.

**کۆمم:** واتا کۆم بووم و پشتم چەماوە.

**کوانوو:** کوانگ، وەجاخ.

**کونجکۆڵ:** ڕادیکاڵ، کەسێ کە لە ڕیشەوە بۆ هەر بابەتێ دەنواڕێ.

**کووک:** cook شێف، ئاشپەز.

**کەبلر:** نزا و(فضیلت) و **گازە:** ڕازونیاز و(مناجات)ـە.

**کەپۆ:** لووت.

**کەپۆی هەوا دایگرتبوو:** واتە ، زۆرخۆبەزلزان بوو.

**کەترە:** هەجو.

**کەتن:** پەن، کەڵەک.

**کەتیبە:** کەندا، لەوح، بەردێ یان تەختە گڵێنەیەک کە لە سەری نووسرابێ.

**کەرستە:** کەرەسە، وەسائیل.

**کەروێشکە:** ڕەوتی گیا.

**کەزیە:** زولف ، قژ.

**کەساسی:** بێدەرەتانی.

**کەسەر:** خەم و ئازار.

**کەسک :** سەوز.

**کەش :** باوەش، لانک, کۆش.

**کەکرە :** زۆر تاڵ، گیاتاڵ.

**کەل :** کراژی مار، پێستی کۆن.

**کەڵات :** قەڵا، بورج.

**کەڵپۆس :** کەوڵپۆس، بەرگی دروستکراوە لە پێست (پێستی کەڵ).

**کەنار :** بەستێن، قەراخی ئاو، ساحیل.

**کەنیشک :** کچ.

**کەوشەن :** سنوور، مەرز، کەوشکەن.

**کەون :** کەونارا، زۆر کۆن، دێرس، دێرینە.

**کەوە :** کەوگ، شینهەڵگەڕاو.

**کەیی :** کەوی،ماڵیی، ئەرامەندە.

**کەوی :** کەویار، خاوەن لەنجە و لار.

**کەیل :** خەمبار.

**گاتینۆ :** نێوی پارکێکی گەورەیە لە ستانی کوبەک لە کانادا و لە باکووری شاری ئۆتاوادایە.






**گارەگار :** دەنگی مامر کاتی هێلکە کردن.

**گارانی :** مەبەست کەسێکە کە زۆر گارەگار دەکات.

**گاز :** قاوکردن، بانگکردن.

**گازە :** ڕازونیاز و (مناجات)ـە.

**گاڤ :** هەنگاو، قەدەم.

**گاوارە :** بێشکە.

**گراجوەیشن :** graduation تەواوکردنی خویندن.

**گراو:** یەخسیر، ئەسیر.

**گراوی:** خۆشەویست، دڵدار ⇦ **گوڵگراوی:** واتە گراوی وەکوو گوڵ.

**گراوندهاگ:** Groundhog لە بنەماڵەی مشک و بە قەد کەروێشکێکە، جۆرێ مشکە کوێرە کە لە وڵاتی کانادا دەژی و لە سەرەتای مانگی ڕەشەمەدا لە بن عەرزەوە سەردەردێنێ و ئەوەش وەک هەواڵی هاتنی بەهارە.

**گرد:** دەور، دەوروبەر، فەراگەرد ⇦ لە گردم: لە دەورم.

**گردی ڕوومەت:** دەوری ڕوومەت.

**گڕکان:** کانی گڕ، کێوی ئاگر.

**گزیرانە:** باج و پیتاکێ کە ڕەعیەت دەیدات بە گزیر.

**گڕژن:** قژن، قژگرژ.

**گڵاژۆ:** گڵئاژۆ[گڵ + ئاژۆ] ئاوێتەی گڵ، قوڕاوی، تەپ و تۆزاوی ف گلالود، گل اندود.

**گۆتە:** دەنگۆ، شایەعە.

**گورپ:** ئاڵگ، لوو. غوددە.

**گوڵ:** بلێسە، گڕ.

**گوڵپەلک:** پەڕەی گوڵ.

**گوڵوەش:** وەکوو گوڵ.

**گەڤەر:** پەڕاوێز

**گوڵووک:** شکۆفە.

**گەرماژۆ:** گەرمهەڵاتوو.

**گەریدە:** کەسی کە زۆر گەڕاوە.

**گەڤەر:** پەڕاوێز.

**گەر مام:** ئەگەر مام و نەمردم.

**گەلاوێژ:** مانگی ناوەڕاستی هاوین، ئەمورتات:

مانگ پەنجەمش مانگ «ئەمورتاتەن»
مانگ بێ مەرگی و کام و هاواتەن

**میر سادقی دینەوەری**

**گەڵاڵە:** پێشنووسی پرۆژە و بەرنامە.

**گەمە:** کایە، شۆخیی.

**گەوارە:** پارچەیەک هەور, گەواڵ.

**گەنجەتی:** گەنجییەتی، جەوانیی.

**گەوشت:** gewişt خوسووسیی، پاوانکراو.
**گەولاز:** پیاو یان ژنێک کە چەندین جار هاوسەرگیری کردبێ.
**گیز:** بسک، زوڵف، پرچ، گیسوو.



**لافە:** قسەی قۆڕ و بێ سەر و بن.
**لان:** هێلانە.
**لانک:** بێشکە، گاوارە.
**لایت:** light سووک و نەرم.
**لڤین:** جووڵان، بزووتنەوە.
**لام:** چەماوە، کۆم.
**لۆت:** ڕووت، پەتیی، قاڵ.
**لۆچ:** چین، چرووک.
**لۆخ:** پیتاک و دەستخۆشانەی دوای هەڵگرتنی خەرمان
**لۆر:** هەل و پلە و پایە ف موقعیت ع مكانة، منصب.
**لۆژ:** تەمبەل، تەوەزەل، قوون گران.
**لۆنا پارک:** نێوی گەردشگایەکە لە بەرزاییەکانی ئێڤین لە شاری تاران.
**لووز:** Lose کەمکردن، ( کەم کردنی کێش ).
**لەپ:** بەری دەست.
**لە خوا و لە حیزبی نەترسابن:** مەبەست بڵیندگۆکەی حیزبوڵڵا بوو کە خێرا خێرا خەڵکی ئاگادار دەکردەوە ئاگایان لە «حیجاب»بێ و خۆیان داپۆشن.
**لەز:** گورج، خێرا، پەلە.
**لەنتەرانی:** وەڵامی نائومید کردن، نامبینیتەوە.
**لەو:** لێو.
**لەهیب:** گڕ و بڵێسە، سووتێنەر.
**لەیت:** Late درەنگ، ( درەنگ کەوتن ).
**لێڕەوار:** دارستانی چڕ.
**لێزک:** چۆڕاوەی ئارەقی لەش.
**لێزمە:** بارانی توند.
**لێفت و ڕایت:** left and right چەپ و ڕاست.
**لێمشت:** لافاو، لەهی، سێڵاو.

**مادام موسیبه :** خاتوو موسیبەت، خاتوو بەڵا ( نازناوی خاوەن دوکان کە لە لایەن ئەو کەسانەی لە دوکان ئیشیان دەکرد، لە سەری دانراوە ) .

**مادی :** ئاماژە بە ڕەچەڵەکی «ماد» .

**ماک :** گەوهەر، هێسن، مادە .

**ماڵتی ڤایتامین :** تێکەڵاوێ لە ویتامینەکان .

**مامر :** مریشک .

**مرژەن :** مرژان، (مرجان)ف .

**مەخابن :** بەداخەوە، حەیف .

**مەش :** مێش .

**مله :** گەردەنە .

**مڵە :** جۆبرِک،ئافەت، دەعبایەکە لە ژێر زەوی شێدارا، ڕەگی گیا و سەوزایی دەخوات .

**مۆتە :** کابووس، خەونی ناخۆش .

**مۆدە :** مۆد، باو .

**مۆلەق :** چاوێ هەڵچوو، بێ بزووتنەوە .

**مول :**[1] سرکە (لای خوارووی کرماشان و ئیلام ) .

**مول :**[2] شەراوی هەنگوور، ئاوی ترێ، چۆرِاوێ کە سەرخۆشیی دەهێنێ .

**مە :** ئێمە

**مەتاع :** کاڵا، شتوومەک .

**مەزەندە :** نرخ، قیمەت .

**مەساف :** ڕووبەڕووبوونەوە .

**مەعجوون :** ماجووم .

**مەک (مەک) :** خوێ، خێ، نمەک .

**مەکگورگ :** Brett Macgork نوێنەری کۆشکی سپی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست .

**مەکیش کەر :** خوێی لێ بدە .

**مەلا تۆفیق :** مەبەست لە کابرایەکی خەڵکی مەغریب کە لە دوکانی مامۆستا کاری دەکرد . بەڵام بە هۆی تەوەزەلییەوە مامۆستا جوابی کرد . ئەو کابرا حەزی لە ئافرەتێ دەکرد ( بیلا )، کە لە هەمان دوکاندا ئیشی دەکرد و ئەم شیعرانە پاش دەرکردنی مەلا، ساز کراوە .

**مەم و زین:** چامەڕۆمانێکی تراجێدییە، لەسەر بناغەی ڕووداوێکی ڕاستەقینە لە لایەن بلیمەتی ویژەی کوردی ئەحمەدی خانیەوە، لە **١٦٩٣**دا هۆنراوەتەوە، لە **١٩١٩** چاپکراوە. هەژار وەریگێڕاوە بۆ سۆرانی. مەمی بۆتان شەیدای خاتوو زینی خوشکی میری بۆتان ئەبێ. بەکۆی وەزیر (بەکرە شۆفار) ئێرەیی پێئەبات و دوخمانی لێئەکات. مەم ئەگیرێ و میر بە نێوبژی تاژەدینی هەڤاڵی مەم لێی خۆش ئەبێ. خاتوو زین هەواڵەکە ئەبا بۆ مەم، بەڵام بەر لەوەی بگاتە لای، بەکۆ ژەهرخواردی کردووە. مەم لە ئامێزی زیندا بۆ چەند ساتێک گیانی دێتەوە بە بەردا. زین لە سۆی مەم خۆی ئەکوژێ و تاژەدین لە تۆڵەی هەردووکیان بەکۆ ئەکوژێ.




**مەشت:** ڕۆژی دوایی، سبحەینێ.
**مەنیا:** مایەوە، جێگیر بوو.
**مەیتەرانە:** وەکوو مەیتەر، وەکوو نۆکەر.
**مێشکەڕۆ:** بێ مێشک.
**مێو و ڕۆن:** (مێم و ڕۆن)، گیراوەیەکە کە لە پیو، واتە چەوری نێو سکی ئاژەڵ لەگەڵ ئاوی شووتیی و زەردەچێوە و دارچین، کە پێش خۆشتن لە گەرماو دەیاندا لە پێست بۆ نەرم کردنەوە و باشتر خاوێن بوونەوەی لەش لە چڵک و کرێش.
**میستەیک:** Mistake ئینگلیسییە، هەڵە.

**میووز:** Muse لە میسۆلۆژیی یۆنانیدا ۹ ماخوا بوون کە هەر کام سەرپەرشتیی هونەر یان زانستێکیان ئەکرد، کالیۆپ Calliope ماخوای بەهرەدەری هۆنراوەی داستانی، کلیۆ Clio ماخوای مێژوو، یوترپی Euterpe موزیک و گۆرانی و بەستە، ئەرەتۆ Erato هۆنراوەی دڵداری، مێلپۆمنی Melpomene ماخوای تراجیدیا، پۆلیهێمنیا Polyhymnia سروود، تراپسیکۆری Terpsichore سەما و هەڵپەڕکێ، تالیا Thalia ماخوای کۆمیدیا، یوورەینیا Urania ماخوای ئەستێرەناسی.





**ناتۆرە:** ناوی ناشیرین، ناونیتکە.

**ناتەریب:** نامیزان. دژرەو.

**ناچیز:** بێ بەها، بێ نرخ.

**ناخۆ (بوون):** لە خۆ بێگانە بوون.

**نار:**❶ ئاگر.

**نار:**❷ هەنار.

**ناراو:** داخاو، زووخاو، ژاراو.

**ناسۆر:** برینێ کە درەنگ چاک دەبێتەوە

**ناڤیگەیشن:** بە کەرەسەی ئەلەکترۆنیی ڕێگادۆزینەوە، گەڕان بۆ شوێنێ

**ناهێسا:** ناڕەحەت.

**نژیارڤان:** ئەندازیار، ئارشیتێکت.

**نوا:** پێشەوە ( بەرەو نوا ): بەرەوپێشەوە.

**نەشتەر:** کەرەسە و تیغێکی نووک تیژ کە برینی پێ هەڵدەدڕن.

**نهۆم:** تەبەقە، قات.

**نەیشن:** نەتەوە، میللەت.

**نەینۆک:** ئاوینە.

**نیسێ:** سیبەر.

**نژیارڤان:** ئەندازیار، ئارشیتێکت.

**نەڤال و ئاڤێستا و بارین:** ٣ شەنگە شەرڤانی شەهیدی عەفرینی دەلال کە قارەمانانە گیانی شیرینیان بۆ ئازادی بەخت کرد.

**نێچیر:** شکار، دەسکەوتی ڕاو.

**نیکۆلاس:** پیاوێکی خەلکی ڕۆژهەلاتی ئورووپا بوو کە پێکەوە لە دووکانی پیتزا کارمان دەکرد.

**نیووفلایت:** New Flight فڕۆکەی تازە نیشتوو.

**وادی:** شوین، وار.

**وادە:** وەعدە، نۆرە.

**وار:**❶ شوێن، جێگا.

**وار:**❷ هەوار، زینگە، ناوچە.

**واز:** مەیل، ئیشتیا، ئارەزوو.

**واکەرۆ:** بیکەرەوە، بیکەوە.

**وان فۆر وان:** One For One ناوی کۆمپانیایەکی فرنچایزی پیتزایە لە شاری ئۆتاوا و مۆنتریاڵی کانادا، خاوەنەکەی کوردە.




**واوێژ:** ولام، جواب.

**وتار:** گوفتار، وێژە.

**ودم:** دەم، نەفەس، هەناسە، نەفەسی پاک.

**وڕینە:** هەپلە، قسەی هەلەق و مەلەق، هەزیان.

**وسمە:** ڕەنگێ کە برۆی پێ دەنەخشێنن.

**وشكارۆ:** وشكهەڵاتوو.

**وەچ:** قازانج، خێر، مەنفەعەت.

**وەزەن:** ئازار.

**وەشت:** باران.

**وەگ:** مەوسم، وەرز.

**وەنەدیی:** E Showcase جامخانەی لە تەختە و شووشە شتوومەکی ڕازاندنەوەی تێدا دادەنێن.

**وەیت:** Weight کێش، سەنگ، قورسایی، وەزن.

**وەیشوومە:** بەڵا و موسیبەت.

**وەیلان:** ئاوارە.

**وێژە:** ئەدەب، ئەدەبیات.

**وی:** ئەو، (ئاماژە بە کەسی سێهەم) تاک.

**هات:** شانس، بەخت.

**هاتەران:** ژاوەبێژیی، وڕینە ف هذیان.

**هاڵ:** تراویلکە، سەراو، سەراب

**های تک:** High_tech تێکنۆلۆژی نوێ و بەرز.

**هزر:** بیر، فکر، ئەندێشە.

**هژمە:** بەردەست، غولام، نۆکەر

**هۆدە:** دیو، ژوور، وەتاغ.

**هۆزان:** زۆر زانا، کەسێک کە هۆکارەکان لێکدەداتەوە، دیالێکتیسیەن.

**هۆک:** مانگرتن (اعتصاب)، کردنەوەی گرێ.

**هۆن:** دەنگی گریانی ئارام.

**هوون:** خوێن، خێن.

**هەپلە:** وڕینە، وڕاوە، ئاتەران.

**هەتوان:** مەڵهەم، مەرهەم.

**هەتەر:** پێداگر.

**هەجو:** کەترە، پێداخوێندن.

**هەرگ:** قوڕ.

**هەز:** واز، ئارەزوو، تامەزرۆیی، حەز، مەیل.

**هەژگ:** چیلکە وداری وشکەوەبوو، دەوەن.

**هەستۆک:** sentimental زۆر هەستیار، هاسیگەری.

**هەسێڵ:** ئەستێر، حەوزی بچووک.

**هەش:** گیایەکە لیلەڕەنگ، لە شیرە و گەڵاکەی خم یان چوویت بەرهەم دێ کە بەنی پێ شین ئەکەن.



**هەگ:** بڵقی سەر ئاو، تۆقلە، حوباب.

**هەڵمەتەکاسە:** چاوچنۆک، بریتییە لە مەردومی زۆرخۆری چنۆک؛ بریتییە لە مەردومی خۆ تێهەڵقورتێن لە هەموو کارێکدا.

**هەڵوەدا:** ئاوارە.

**هەڵهێنانەوە:** گەڕانەوەی خۆراک لە گەدەوە بۆ ناودەم.

**هەنگەبین:** هەنگوین.

**هەنگین:** هەنگوین.

**هەنوو:** هێشتا، هەنووکە.

**هەنووکە:** هەرئێستا، ئێستە، نها، لەم کاتەدا ف جاری، وقت جاری.

**هەودا:** تاڵ، تاڵی موو یاخود بەن.

**هەوێن:** ئامیان، مایە.

**هەوێڵ:** ناوچە، گەڕەک.

**هەیڤ:** مانگ.

**هێژ:** نرخ، بایەخ، بەها.

**هێما:** هێشتا، هێژان.

**هێمان:** هێشتا، هەنوو.

**یووئێن:** UN نەتەوە یەکگرتووەکان.

**یەم:** دەریا، زرێ.

ژمارەی هۆنراوە

# پێڕست :

ژمارەی هۆنراوە

ژمارەی هۆنراوە

ژمارەی هۆنراوە

ژمارەی هۆنراوە

ژمارەی هۆنراوە